# ڕێزمانی کوردی

د. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو

چاپی پێنجەم
چاپی چاککراو و زیادکراو

* ناوی کتێب: ڕێزمانی کوردی

* نووسینی: د.نەریمان عەبدوڵڵاخۆشناو

* تایپێست و نەخشەسازی: کۆچەر ئەنوەر

* چاپ: پێنجەم ٢٠١٣

* چاپخانە: چاپخانەی هێڤی/ هەولێر

* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

* نرخ : ٤٠٠٠

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٦)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە.

# ناوەرۆك

# پێشەکی چاپی دووەم

لەچاپی یەکەمدا، بەداخەوە هەندێ هەڵەی چاپی تێکەوتبوو، بۆیە لەم چاپەدا هەموو هەڵەکانمان چاککردۆتەوە، لەگەڵ زیادکرنی هەندێ بابەتی زۆر گرنگی بواری ڕێزمانی کوردی، کە ئەوانیش بریتین لە ( چاوگ، ڕەگی کار، قەدی چاوگ )، کە بەداخەوە زمانناسانی کورد زۆر بەدەگمەن خۆیان لەم لایەنە گرنگانەی زمان داوە، بەتایبەتی لە قۆناغی زانکۆ، بەهۆیەوە زۆربەی مامۆستایان و پسپۆرانی زمانی کوردی خۆیان لەم لایەنانە دوورخستۆتەوە، هەر بۆیەشە ئێمە لەم ڕوانگەیەوە هەوڵماندوە ئەم بابەتە بۆ ئارەزوومەندان و خوێنەرانی زمانی کوردی ڕوونبکەینەوە .

لە کۆتاییدا هیواخوازین دڵسۆزانی زمانی کوردی لە کەموکوورییەکانی ئەم کتێبە و سەرجەم کتێب و نووسینەکانی خۆمان ئاگادارمان بکەنەوە .

# پێشەکی چاپی یەکەم

ڕێزمـان ئاسـتێکە لـە ئاسـتەکانی زمـان، کـە بەهۆیـەوە هـەردوو لایـەنی مۆرفۆلۆژی و سینتاکس دەگرێتەخۆ، ئەم ئاسـتە تـا هەنووکـە شـتێکی زۆری لەسـەر نەنووسراوە، بەتایبەتی بەشەکانی ئاخاوتن، بەجۆرێك ئەوەی نووسراشە پڕە لە هەڵە و کەموکووڕی زانستیی، تەنیا چەند دانەیەکی کەمیان نەبێت، کـە بـە پەنجـەی دەسـت دەژمێردرێن بەتایبەتی بەرهەم و شـاکارە بەناوبانگـەکانی بـاوکی زمانـەوانانی کـورد (د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف)، کە زۆر دڵسۆزانە خزمەتی زمان و زمانـەوانی کـوردی کردووە، هەر بۆیەشە ئێمە لەم کتێبەدا سوودێکی زۆرمان لـە بەرهەمـەکانی بینیـوە، بەو واتایەی کردوومانەتە بناغەیەك بۆ نووسین و دانانی ئەم کتێبە، تەنانەت دەتـوانین بڵێین کە تـا دونیـا مـاوە هـیچ نووسـینێك ناگـات بـە قوولـە پێیـەکی نووسـینەکانی ئەوڕەحمانی حاجی مارف .

ئەم کتێبە هەر (دە) بەشـەکانی ئاخـاوتن دەگرێتـەخۆ، کـە ئـەوانیش بـریتین لـە (نـاو، جێنـاو، ئاوەڵنـاو، کـار، ئاوەڵکـار، ژمـارە، پارتیکـل، پێشـبەند، ئـامرازی بەستنەوە، ئامرازی سەرسوڕمان و بانگکردن ).

ئەوەی جێگەی باسکردنە هەردوو بەشە ئاخاوتنی (ژمارە) و (پارتیکل) تا هەنووکە زۆرێك لە زمانەوانان بە بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆ سەیری ناکەن، بەڵام لێکۆڵینەوەکەی ئێمە لە سەر بنەمای زانستیی و واقیعی زمانی کوردی سەیری بەشە ئاخاوتنەکانی کردووە، هەربۆیەشە وەکو دوو بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆ سەیری (ژمارە) و (پارتیکل)مان کردووە.

نەریمان خۆشناو / هەولێر ١/١/٢٠٠٩

# ڕێزمان

ئاستێکە لە ئاستەکانی زمان، کە لە هەردوو لایەنی وشەسازی و ڕستەسازی دەکۆڵێتەوە. لە ڕێزماندا باس لەو یاسایانە دەکرێ، کە دەنگ و واتا بە یەك دەگەیەنێت.




**دەنگسازی:** ئەو زانستەیە کە لە هەردوو لایەنی فۆنەتیك و فۆنۆلۆجی دەکۆڵێتەوە.

**فۆنەتیك:** لقێکە لە زانستی دەنگ، کە لە پەیدابوونی دەنگ و ژمارەی دەنگەکان لە هەر زمانێکدا دەکۆڵێتەوە. هەروەها ئاماژە بەو کەرەستانە دەکات کە بەشداری لە دروستکردنی دەنگ دەکات، بەتایبەتی (دەم، لووت، مەلاشوو، ...). کەواتە بەکورتی فۆنەتیك لایەنی تیۆریی دەنگ دەگرێتەخۆ.

**فۆنۆلۆجی:** لقێکە لە زانستی دەنگ، تیایدا ئاماژە بە یاساکانی دەنگ دەکات، وەکو: (یاساکانی پەیدابوونی دەنگ، تێچوونی دەنگ، جێگۆڕکێی دەنگ،... هتد). بەو واتایەی فۆنۆلۆژی لایەنی پراکتیکی دەنگ دەگرێتەخۆ.

**ڕێزمان:** ئاستێکە لە ئاستەکانی زمان، کە لە هەردوو لایەنی وشەسازی (مۆرفۆلۆجی) و ڕستەسازی (سینتاکس) دەکۆڵێتەوە.

**وشەسازی** (مۆرفۆلۆجی): زانستێکە لە وشە یاخود مۆرفیم دەکۆڵێتەوە. لە وشەسازیدا ئاماژە بۆ بەشەکانی ئاخاوتن (ناو، جێناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار، کار... هتد) دەکرێت.

**ڕستەسازی**(سینتاکس): ئەو زانستەیە کە لە ڕستە دەکۆڵێتەوە، واتە باسی ڕستە لە ڕووی پێکهاتنەوە (سادە، لێکدراو، تێکەڵ)، هەروەها ڕستە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە (هەواڵگەیاندن، پرسیارکردن، سەرسوڕمان، فەرماندان)دەکات. جگە لەوەش ئاماژە بۆ کەرەسە سەرەکییەکان و لاوەکییەکانی ڕستە دەکات (بکەر و جۆرەکانی، بەرکار و جۆرەکانی، نیهاد، گوزارە،...هتد) .

**واتا:** ئاستێکە لە ئاستەکانی زمان، کە لە هەردوو لایەنی واتاسازی و پراگماتیك دەکۆڵێتەوە.

**واتاسازی:** ئەو زانستەیە کە لە واتای وشە و ڕستەکانی زمان دەکۆڵێتەوە، واتە باسی پێوەندییە واتاییەکان (هاوواتا، دژواتا، فرەواتا، هاوبێژی، لێڵی...) دەکات، هەروەها باسی گریمانەکانی واتا (گریمانەی هێمایی، گریمانەی سێگۆشەی واتایی، گریمانەی ناولێنان...هتد) دەکات.

**پراگماتیك:** لقێکە لە واتا، کە واتاکەی لە سەرووی لایەنی واتاسازییەوەدیە، ئاماژە بەو کەرەسانە دەکات پێشوتر لە ئەدەبدا باسیان لێوەکراوە بە تایبەتی لایەنەکانی ڕەوانبێژی، هەروەها باسی ئەو کەرەسانە دەکات، کە ناچنە ناو وشەسازی و ڕستەسازی و واتاسازی، وەکو (هێز، ئاواز، گریمانەی پێشبینی، گریمانەی پاشینە، ئاماژە.......هتد).

# بەشەکانی ئاخاوتن

سەرەتای پەیدابوونی بەشەکانی ئاخاوتن دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەفلاتوون، واتە ئەفلاتوون یەکەم کەس بوو بەشەکانی ئاخاوتنی دۆزییەوە، کە ئەوکات پێیان دەوت (بەشەکانی وشە)، دواتر زمانەوانانی دی لێکۆڵینەوەی زیاتریان لە بەشەکانی ئاخاوتن کرد و چەندین لق و پۆپیان دۆزییەوە.

بەشەکانی ئاخاوتنیش لە قوتابخانە زمانەوانییەکانی (ڕووسی، ئینگلیزی، ئەمەریکی، جنێڤ، پراگ،...هتد) لێی دەکۆڵدرێتەوە، هەر بۆیە جیاوازی لە ژمارەی بەشە ئاخاوتن لە قوتابخانەیەکی زمانەوانییەوە بۆ قوتابخانەیەکی تری زمانەوانی جیاوازی لە ڕووی ژمارەی بەشە ئاخاوتنەوە دەبینرێت، بەتایبەتی قوتابخانە زمانەوانییەکانی ئینگلیزی و ئەمەریکی جیاوازن لەگەڵ قوتابخانەی زمانەوانی ڕووسی، چونکە لە هەردوو قوتابخانە زمانەوانییەکانی ئەمەریکی و ئینگلیزی، (هەشت) بەشە ئاخاوتن دیاری دەکرێت، بەڵام لە قوتابخانەی زمانەوانی ڕووسی (مۆسکۆ)، (دە) بەشە ئاخاوتن ئاماژەی بۆ دەکرێت، واتە جیاوازییەکە لە هەردوو بەشە ئاخاوتنی (ژمارەو پارتیکل)دایە، چونکە بەشە ئاخاوتنەکانی(ژمارە و پارتیکل) لە قوتابخانەی زمانەوانی ڕووسی وەك دوو بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆ سەیردەکرێن، بەڵام لە قوتابخانە زمانەوانییەکانی ئەمەریکی و ئینگلیزی وەك بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆ سەیر ناکرێن، بەڵکو وەکو لق و تەوەرەیەك لەگەڵ بەشەکانی تری ئاخاوتنەوە سەیر دەکرێن.

## قوتابخانەی زمانەوانی ڕووسی (کلاسیك):

١. ناو
٢. جێناو
٣. ئاوەڵناو
٤. کار
٥. ئاوەڵکار
٦. ژمارە
٧. پارتیکل

٨. ئامرازی بەستنەوە
٩. ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشت
١٠. پریپۆزیشن (پێشبەند)

## قوتابخانەی زمانەوانی ئەمەریکی و ئینگلیزی (نوێگەری):

١. ناو
٢. جێناو
٣. ئاوەڵناو
٤. کار
٥. ئاوەڵکار
٦. ئامرازی بەستنەوە
٧. پریپۆزیشن (پێشبەند)
٨. ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشت

بەشە ئاخاوتنەکان (ناو، جێناو، ئاوەڵناو، کار، ئاوەڵکار، ژمارە) بە وشەی تەواو ناودەبرێن، کەچی بەشە ئاخاوتنەکانی پریپۆزیشن (پێشبەند)، ئامرازی بەستنەوە، پارتیکڵ، ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشت) بە وشەی ناتەواو ناودەبرێن.

**وشەی تەواو:** بەو وشانە دەوترێ کە بە تەنیا بەکاردێن و بە تەنیاش واتا دەبەخشن.

**وشەی ناتەواو:** بە تەنیا بەکارنایەن، بەڵکو پێویستی بە کەرەسەی دی هەیە بۆ ئەوەی واتا ببەخشن.

# نـــاو

**١ـ ناو لە ڕووی ژمارەوە:**

٣. ناوی تاك

٤. ناوی کۆ

**٢ـ ناو لە ڕووی ناسینەوە:**

٣. ناوی ناسراو

٤. ناوی نەناسراو

**٣ـ ناو لە ڕووی هەبوونەوە:**

٣. ناوی مادی

٤. ناوی مەعنەوی

**٤ـ ناو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە:**

٤. ناوی تایبەتی

٥. ناوی گشتی

٦. ناوی کۆمەڵ

**٥ـ ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە:**

٤. ناوی سادە

٥. ناوی دارِژاو

٦. ناوی لێکدراو

**٦ـ ناو لە ڕووی ڕەگەزەوە:**

٥. ناوی نێر

٦. ناوی مێ

٧. ناوی بێلایەن

٨. ناوی دوو لایەن

**٧ـ ناو لە ڕووی ئەرکەوە:**

(بکەر و جۆرەکانی، بەرکار و جۆرەکانی، نیهاد، گوزارە، تەواوکەری ناو، تەواوکەری کاری ناتەواو.......هتد).

## پێناسینی ناو:

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن،ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە بەسەر گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان ڕووداوێك دەنرێت یان دادەبڕێ، کە دەبێتە هۆی دیاری کردنی.

## پۆلێنکردنەکانی ناو[١]

**١ ـ ناو لە ڕووی ژمارەوە**

ناو لە ڕێزمانی کوردیدا لە ڕووی ژمارەوە بەسەر تاك و کۆ دابەشدەکرێ، بەمشێوەیە:

**أـ ناوی تاك:**

بەو ناوانە دەوترێ کە بۆ تاکە کەسێك یان بۆ تاکە شتێك بەکاردێت.وەکو:(کوڕ، کچ، ژن، چەقۆ، چرا...........هتد) .

**ب ـ ناوی کۆ:**

بەو ناوانە دەوترێ کە بۆ کۆمەڵە کەسێك یاخود کۆمەڵە شتێك بەکاردێن، کە لە دوو شت یان دوو کەس زیاتربێ . لە زمانی کوردیدا بە هۆی نیشانەی تایبەتییەوە ناوێك لە تاکەوە دەگۆڕدرێ بۆ کۆ، بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

١- بۆ ئەم بەشە ئاخاوتنە بگەڕێوە بۆ: د.ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی یەکەم (ناو)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٧٩.

١. بە هۆی نیشانەی سەرەکی (ان)، کە لە زمانی کوردیدا نیشانەی سەرەکی کۆیە. دەچێتە سەر بەشی دواوەی ناو. لە کاتی وەرگرتنی نیشانەی کۆدا، ئەگەر ناوەکە بە پیتی نەبزوێن کۆتایی هاتبوو، ئەوە هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، بەڵکو وەك خۆی دەنووسرێ، وەکو:

**کوڕ+ ان ................ کوڕان**

**کچ + ان ................ کچان**

**پیاو+ ان ................ پیاوان**

**ژن + ان ................ ژنان**

بەڵام ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە پیتی بزوێن هاتبوو، ئەوە گۆڕانکاری بەسەردادێ، واتە لە هەندێ حاڵەتدا پیتی (ی) نەبزوێن دێتە نێوان ناوەکە و نیشانە کۆیەکەوە، لە هەندێ حاڵەتی تردا (ە) تێ دەچێت، هەروەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

**مامۆستا + ان ......... مامۆستایان**

**قوتابخانە + ان .......... قوتابخانان**

**چەقۆ+ ان ..............  چەقۆیان**

٢. بەهۆی نیشانەی ناسەرەکی، کە نیشانەکانی (ات، هات، جات، وات، گەل، ەها) دەگرێتەوە، و دەچنە سەر ناو و لە تاکەوە دەیگۆڕن بۆ کۆ. هەر بۆیەش پێی دەوترێ نیشانەی ناسەرەکی، چونکە ئەم نیشانانە دەچنە سەر چەند ناوێکی دیاریکراو لە زماندا، هەروەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

**باخ + ات ............. باخات**

**دێ + هات ............  دێهات**

**سەوزە + وات ........... سەوزەوات**

**میوە + جات ..........  میوەجات**

**مێ + گەل ............ مێگەل**

**کوڕ + گەل ............ کوڕگەل**

**جار + ەها ............ جارەها**

**ساڵ + ەها ............ ساڵەها**

**٢ـ ناو لە ڕووی ناسینەوە**

ناو لە زمانی کوردیدا لە ڕووی ناسینەوە بەسەر ناوی ناسراو و ناوی نەناسراو دابەشدەکرێت:

**أ ـ ناوی ناسراو:**

لە زمانی کوردیدا بە چەندین شێوە ناو ددبێتە ناسراو:

١ـ بەهۆی نیشانەی (ەکە) یان هەندێ جار بە نیشانەی (ە) ناو دەبێتە ناسراو. ئەم نیشانەیە دەچێتە سەر بەشی دواوەی ناو و لە نەناسراوەوە دەیکات بە ناسراو، وەکو:

کوڕ + ەکە .......... کوڕەکە

چرا + ەکە ......... چراکە (بە تێچوونی بزوێن)

چرا + ەکە ......... چرایەکە (پەیدابوونی نەبزوێن)

برا + ەکە ......... براکە ـ برایەکە (بە تێچوونی بزوێن)، (پەیدابوونی نەبزوێن)

لێرەشدا دەبێ ئاگاداری پیتی بزوێن و پیتی نەبزوێن بین، چونکە بە هۆی بوونی پیتی بزوێن لە کۆتایی وشەوە، ئەوە گۆڕانکاری ڕوودەدات، هەروەکو لەم نموونانەی سەرەوەدا دەرکەوتووە .

٢ـ بەبێ نیشانەی (ەکە)، کە ئەمیش لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا ناو دەبێتە ناسراو:

ـ ناوی تایبەتی، ناسراوە، وەکو ناوی مرۆڤ ( ئەحمەد، ڕزگار، نەسرین، شیرین......)، ناوی ئاژەڵ ( شێر، گورگ......)، ناوی وڵات ( عێراق، ئێران،.....)، ناوی هەرێم (کوردستان، باسك،....)، ناوی شار ( هەولێر، دهۆك،......)، ناوی قەزا( قەڵادزێ،

سۆران، .....)، ناوی ناحیە ( عەنکاوە، سەنگەسەر، .....)، ناوی لادێ ( سووردەدێ، گردجۆتیار، ...).

ـ ئەگەر ناوێك بەهۆی ئاوەڵناوی نیشانەوە دەست نیشان بکرێت، ئەوە ئەو ناوە دەبێتە ناوی ناسراو، وەك:

**ئەم کوڕە زیرەکە .**

لێرەدا وشەی ( کوڕ )ناوێکی ناسراوە، چونکە بەهۆی ئاوەڵناوی نیشانەی (ئەم........ە) دەست نیشانکراوە.

ـ بەهۆی ئامرازی دانەپاڵەوە، بەو واتایەی ئەو وشانەی بەهۆی ئامرازی دانەپاڵەوە دەخرێنە پاڵ یەکتری دەچێتە حاڵەتی ناسراویی، وەك:

**کچی ئازاد جوانە .**

جێگای ئاماژەپێکردنیشە، ژمارەی پیت لە زمانی کوردیدا (٣٧) پیتە، کە بەسەر بزوێن و نەبزوێن دابەش دەکرێن:

**١. پیتی بزوێن (٨) پیتن، ئەوانیش پیتەکانی (ە، ا، i بزرۆکە، و، وو، ۆ، ی، ێ).**

**٢. پیتی نەبزوێن (٢٩) پیتن، ئەوانیش پیتەکانی ( ئـ، ب، پ، ت، ج، ح، خ، چ، د، ر، ڕ، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ق، ڤ، ك، گ، ل، ڵ، م، ن، ه، و، ی ).**

**ب ـ ناوی نەناسراو:**

بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ حاڵەتی نەناسراوی بەکاردێن، ناوی نەناسراویش هەندێ جار بەهۆی نیشانەی نەناسراوی دروست دەبێت، نیشانەی نەناسراویش (ێ، ێك، ەك)ە، کە دەچێتە بەشی دواوەی ناوەکە، هەندێ جارێش بە بێ نیشانە ناوەکە خۆی نەناسراوە.

کوڕ + ێ، ێك، ەك ................ کوڕێ، کوڕێك، کوڕەك

**کوڕێك هاتە ماڵمان.**

کچ + ێ ..................... کچێ

چرا + ەك، یێ، یێك ............... چرایەك، چرایێ، چرایێك

**نازدار چرایێك بکڕە.**

**٣ ـ ناو لە ڕووی هەبوونەوە**

بەسەر سێ جۆر دابەشدەکرێت :

**١ـ ناوی ماددی:**

بەو ناوانە دەوترێت کە بوونێکی سەربەخۆ و واقیعیان هەیە و بەر یەکێك لە هەستەکانی مرۆڤ دەکەون. بۆنموونە: دار، پەنجەرە، کورسی، مێز...

**٢ ـ ناوی واتایی (مەعنەوی):**

ناوێکە خۆی لەخۆیدا بوونی سەربەخۆی نییە، بەڵکو لە هزر و خەیاڵدا پەیدا دەبێت و بەر هیچ یەکێك لە هەستەکانی مرۆڤ ناکەوێت. ئەویش دەکرێت بە دوو جۆرـ

**أ ـ ناوی واتایی بنجی:**

هەر خۆی لەبنەڕەتدا ناوێکی واتاییە و بۆ ئەم مەبەستە دانراون، وەکو: شەرم، هێز، خەم، خەو، ڕەنج، جەنگ، دەروون، گیان، هۆش، بڕوا...هتد.

**ب ـ ناوی واتایی نابنجی:**

ئەو ناوانە لە بنەڕەتدا مادین، بەڵام بەهۆی پاشگرەوە دەبنە ناوی واتایی، کە بەم جۆرە دێتە دروستکردن: ـ

**١ـ ناو + پاشگرەکانی (ی، ەتی، یەتی، ایەتی، یێتی، ینی، اتی، یی.......)= ناوی واتایی نابنجی**

برا + ەتی = برایەتی

پیاو+ ەتی = پیاوەتی

برا + ی = برایی

**٢ـ هاوەڵناو + پاشگرەکانی (ی، یەتی،ێتی، ایی، ە، اتی، .....) = ناوی واتایی نابنجی**

أ ـ ئاوەڵناوی چۆنیەتی، وەك: ڕەشی، باشی، بڵندی، ناشنایەتی، نازایەتی.

ب ـ ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو، وەك: نووسەری، سەرپەرشتیاری، دانایی، زانایی.

جـ ـ ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو، وەك: گەشبینی، گیانبازی.

**٣ـ ڕەگی کار + پاشگری (ە) = ناوی واتایی نابنجی**

پرس + ە = پرسە

ناڵ + ە = ناڵە

**٤ـ قەدی چاوگ + پاشگری (ار) = ناوی واتایی نابنجی**

کرد + ار = کردار

مرد + ار = مردار

**٥- ڕەگی کار + پاشگری(ی) = ناوی واتایی نابنجی**

دز + ی= دزی

**٤ـ ناو لە ڕووی ناوەرۆکەوە**

بەسەر سێ جۆر دابەشدەکرێت :

**١ـ ناوی گشتی:**

بەو ناوانە دەوترێ کە بە هەموو ناوێکی گیاندار و یان بێگیانێك دادەبڕێ، کە خاوەنی یەك ڕەگەزن، بەو واتایەی کە کەسێك یان شتێکی دیاریکراو پیشان نادات، وەکو: (ڕووبار، چیا، دەشت، کوڕ، کچ، ژن، پیاو،... هتد).

نموونە: **کوڕێکی زیرەکە.**

**پیاوێکی باشە.**

**٢ـ ناوی تایبەتی:**

بە ناوی گیاندار و بێگیانی دیاریکراو دەوترێت، بەو واتایەی کە کەسێك یان شتێکی دیاریکراو پیشان دەدات. وەکو:

**ڕووبار/ ئاراس، فورات، دیجلە ...... هتد .**

**زێ/ بچووك، گەورە، سیروان ........ هتد .**

**چیا/ سەفین، ئاسۆس، هەلگورد .... هتد .**

وشەکانی (ڕووبار، زێ، چیا) ناوی گشتین، بەڵام وشەکانی (ئاراس...، سیروان...، سەفین...) ناوی تایبەتین.

**ڕوبـاری فـــورات لـــە عێـراقـدایـــە.**

ناوی گشتی ناوی تایبەتی

**٣ـ ناوی کۆمەڵ:**

بەو ناوانە دەوترێت کە لە ڕواڵەتدا تاکن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا کۆن.

نموونە: هۆز، عەشیرەت، لەشکر، چین، توێژ، دەستە، گروپ....

نموونە: **دەستەیەك پێنووسم بۆ بکڕە.**

**لەشکری دوژمن بەرێوەیە.**

**٥ـ ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە**

بەسەر سێ جۆر دابەشدەکرێت :

**١ـ ناوی سادە:**

لە وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ پێکهاتووە، بە مەرجێ ئەم وشەیە ناو بێت، وەکو: ئازاد، ڕزگار، دار، بەرد، چاو، کەو،...هتد.

**٢ـ ناوی داڕژاو:**

بەو ناوانە دەوترێت، کە لە وشەیەکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یاخود پاشگرێك یاخود هەردووکیان پێك دێت، بەم شێوەیەی خواردوەن

**أ ـ ناوی سادە + پاشگر (گەر، دار، ساز، بەند، وان، چی، باز، کەر، مەند،...هتد) = ناوی داڕژاو**

ئاسن + گەر = ئاسنگەر

سەر + باز = سەرباز

هونەر + مەند = هونەرمەند

چای + خانە = چایخانە

شەو+ گار = شەوگار

**ب ـ ناوەڵناوی سادە + پاشگر ( ی، یی، یەتی، ایەتی، ە، ایی، ێنە،... هتد) = ناوی داڕژاو**

بڵند + ایەتی = بڵندایەتی

گۆج + ی =گۆجی

توورە + یی =توورەیی

مەرد + ایەتی =مەردایەتی

خراپ + ە = خراپە

پاك + انە = پاکانە

**جـ ـ کاری سادە + پاشگر = ناوی داڕژاو**

وت + ار = وتار

کوشت + ار = کوشتار

دروو + مان = دروومان

**د- ڕەگی کار + پاشگر = ناوی داڕژاو**

نووس + ەر = نووسەر

پرس + یار = پرسیار

**هـ ـ ئاوەڵکاری سادە + پاشگر = ناوی داڕژاو**

بن + ار = بنار

پێش + ەوا = پێشەوا

**و ـ پێشگر + ڕەگی کار = ناوی داڕژاو**

پێ + ویست = پێویست

**٣ـ ناوی لێکدراو:ـ**

بەو وشانە دەوترێت، کە لە دوو وشەی واتاداری سەربەخۆ یان زیاتر پێک دێت، بەمشێوەیە:ـ

**١ـ ناوی سادە + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

شا + هەنگ = شاهەنگ

مار + ماسی = مارماسی

**٢ـ ناوی سادە + و + ناوی سادە(هاوواتا) = ناوی لێکدراو**

ئاخ + و + داخ = ئاخ و داخ

ئاه + و + ئۆف= ئاهوئۆف

**٣ـ ناوی سادە + ناوبەند + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

بەرد + ە + نوێژ = بەردەنوێژ

کولێرە + بە + ڕۆن = کولێرە بەڕۆن

**٤ـ ناوی سادە + ناوبەند + ئاوەڵناو = ناوی لێکدراو**

مێرگ + ە + سوور = مێرگەسوور

**٥- ئاوەڵناوی سادە + ناو = ناوی لێکدراو**

ڕەش + ماڵ = ڕەشماڵ

**٦- ئاوەڵناوی سادە + ناوبەند + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

ڕەش + ە + با = ڕەشەبا

**٧- ناوی سادە + ڕەگی کار = ناوی لێکدراو**

دار + تاش = دارتاش

دڵ + خواز = دڵخواز

برا + زا = برازا

**٨- ناوی سادە + ناوبەند + قەدی چاوگ = ناوی لێکدراو**

دەست + و + برد = دەست و برد

**٩- کاری ڕابوردوو + ناوبەند + ڕەگی کار = ناوی لێکدراو**

هات + و + چۆ = هاتوچۆ[1]

گفت + و + گۆ =گفتوگۆ

مشت + و + ماڵ =مشتوماڵ

**١٠- ئاوەڵکار + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

پێش + نوێژ = پێش نوێژ

بەر + ماڵ = بەرماڵ

**١١- ئاوەڵکار + ناوبەند + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

پاش + ە + ڕۆژ = پاشەڕۆژ

---

[1] چاوگی (چوون)، ڕەگەکەی(چ)ە، بەڵام لێرەدا (ۆ) وەکو حاڵەتێکی فۆنۆلۆجی دەرکەوتووە .

**١٢ـ ناوی سادە + ناوبەند + وشەیەکی بێ واتا= ناوی لێکدراو**

قەرز + و + قۆڵ = قەرزوقۆڵ

گوڵ + و + موڵ = گوڵومول

**١٣ـ ڕەگی کار + ناوبەند + وشەیەکی بێ واتا = ناوی لێکدراو**

کوڵ + و + کۆ = کوڵوکۆ

**١٤ـ ناو + ناوبەند + ناو = ناوی لێکدراو**

قرچ + ە + قرچ = قرچەقرچ

چەق + ە + چەق = چەقەچەق

جیڕ + ە + جیڕ = جیڕەجیڕ

**١٥- وشەیەکی بێ واتا + و + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

فڕ + و + فیێڵ = فڕوفیێڵ

گژ + و+ گیا = گژوگیا

**٦ـ ناو لە ڕووی ڕەگەزەوە**

**ناو لە زمانی کوردیدا لە ڕووی ڕەگەزەوە، بە سەر ناوەکانی (نێر، مێ، دوولایەن، بێلایەن ) دابەشدەکرێ، بەم شێوەیەی خوارەوە :**

**ناوی نێر:** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ ڕەگەزی نێر بەکاردێن، کە بەم شێوەیەی خوارەوەن :

- ناوی تایبەتی کوڕان : ئازاد، شێرزاد، محەمەد... هتد.
- ناوی کەسانی نێر : باوك، خاڵ، مام، کوڕ...هتد.
- ناوی گیانلەبەری نێر : کەڵەشێر، هەسپ، یەکانە،...هتد.
- ناوی پیشەی پیاوان: نانەوا، فیتەر، گۆشت فرۆش، خزمەتکار، گاوان......هتد.

**ناوی مێ:** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێن، کە بەم شێوەیەی خوارەوەن :

- ❖ ناوی تایبەتی کچان: سۆزان، نێرگز، نەمام...هتد.
- ❖ ناوی کەسانی مێ : دایك، خالۆژن، کچ...هتد.
- ❖ ناوی گیانلەبەری مێ: مریشك، ماین، مالۆس...هتد.
- ❖ ناوی پیشەی کچان: جلشۆر، نانکەر، تەشی ڕێس،...هتد.

**ناوی دوولایەن:** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ بەکاردێن.

وەك: قوتابی، مامۆستا، ئامۆزا، کەو، ورچ، سەگ...هتد.

هەندێکجار ئەم ناوە دوولایەنانە بەهۆی بەکارهێنانی وشەیەك لەگەڵیاندا، دەتوانرێ بکرێ بە ناوی نێر یان ناوی مێ، وشەکانیش بریتین لە (نێر، مێ، ما، دێڵ، گۆڵ،...هتد)، وەکو:-

| ناوی دوولایەن | بۆ نێر | بۆ مێ |
|---|---|---|
| پڵینگ | پڵینگی نێر | پڵینگی مێ |
| سەگ | گۆڵە سەگ | دێڵە سەگ |
| ورچ | نێرە ورچ | دێڵە ورچ |
| گیسك | گیسکی نێر | گیسکی مێ |
| کەو | نێرەکەو | ماکەو |
| بەراز | یەکانە | مالۆس |

**ناوی بێلایەن:** بەو ناوانە دەوترێت کە ڕەگەزی نێر و مێی تێدا نییە .

وەك: دار، بەرد، کورسی، مێز...هتد.

**٧- ناو لە ڕووی ئەرکەوە :**

ناو لە ڕستەدا دەتوانێت ئەرك ببینێت، واتە دەتوانێت ببێت بە (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە، تەواوکەری ناو، تەواوکەری کار......هتد).

**بکەر:** ناو کاتێ ئەرکی بکەر دەبینێ، ئەگەر کارێك ئەنجام بدات، چونکە بکەر کەسێکە یان شتێکە،هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کارێك یاخود تەنها شوێنی بکەرەکە لە ڕستەدا پڕدەکاتەوە، وەکو:-

**شێرزاد چوو بۆ بازاڕ.**

**بکەر**

**باران باخچەکەی تێکدا.**

**بکەر**

**پەنجەرەکە شکا.**

**بکەر**

**کەپرەکە ڕووخا.**

**بکەر**

**شیلان نانی خوارد.**

**بکەر**

بکەریش پێنج جۆری هەیە:

١. بکەری ڕێزمانی.

٢. بکەری لۆجیکی.

٣. بکەر دیار.

٤. بکەرنادیار.

٥. بکەرنادیاری ئاماژەپێکراو.

١- **بکەری ڕێزمانی:** بەو بکەرانە دەوترێت، کە تەنیا لە ڕووی ڕێزمانەوە بکەرن، واتە بکەری ڕاستەقینەی ڕستەکە نین، وەکو:

**دۆیەکە ڕژا.**

**کەپرەکە ڕووخا.**

**پەنجەرەکە شکا.**

٢- **بکەری لۆجیکی:** بەو بکەرانە دەوترێت، کە لە ڕووی واتاوە کارەکانیان ئەنجامداوە، و بکەری ڕاستەقینەی ڕستەکەن، وەکو:

**تریفە هات.**

**شێرزاد دەنگی کامەران دەبیستێت.**

٣- **بکەردیار:** بەو بکەرانە دەوترێت، کە لە ڕستەدا دەوریان هەیە و دەردەکەون، ئینجا بکەرەکە ڕێزمانی بێت یان لۆجیکی. وەکو:

**کەپرەکە ڕووخا.**

**ڕزگار پەنجەرەکەی شکاند.**

**ڕێزان چێشتەکەی لێنا.**

٤- **بکەرنادیار:** بەو بکەرانە دەوترێت کە لە ڕستەکەدا بوونیان نیە، یاخود دەرناکەون، وەکو:

**پەنجەرەکە شکێنرا.**

**ڕزگار کوژرا.**[1]

---

[1] - بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی بکەر و جۆرەکانی، بگەڕێوە بۆ: نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، بکەر نادیار، سەنتەری ڕوناکبیری هەتاو، هەولێر، چاپخانەی شەهاب، ٢٠٠٧.

**٥- بکەرنادیاری ئاماژە پێکراو:** بەو بکەرانە دەوترێت کە لە ڕووی ڕوخسارەوە ڕستەکان بکەریان نادیارە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بکەریان لە شوێنێکی تری ڕستەکەدا دەرکەوتووە، بۆیە بەم جۆرە بکەرانە دەوترێت بکەرنادیاری ئاماژەپێکراو، وەکو:

**ئازاد بەدەستی ڕزگار کوژرا.**

**بەناز لەڕێگەی تریفەوە هێنراوە.**

**نیهاد:** ئەرکێکە لە ئەرکەکانی ناو، وشەیەکە ڕوودانی کارەکە ئەنجام نادات، بەڵکو زیاتر سیفەتێکە دەدرێتە پاڵی. نیهاد کاتێك لە ڕستەدا پەیدادەبێت، ئەگەر کاری ناتەواو لە ڕستەکەدا هەبێت.

**کاری ناتەواو:** بەو کارانە دەوترێ کە بە تەنیا بەکارنایەن، بەڵکو دەچنە پاڵ وشەیەکی ترەوە، کارە ناتەواوەکانیش لە زمانی کوردیدا لە چاوگی (بوون)ەوە وەرگیراون، کە بۆ هەر سێ حاڵەتی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو بەکاردێن، بەم شێوەیەی خوارەوە:

(بوو)...... بۆ کاتی ڕابوردوو

شێرزاد زیرەك بوو.

کاری ناتەواوە بۆ کاتی ڕابوردوو

(ە)......... بۆ کاتی ئێستا

قوتابییەکە زیرەکە.

کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا

ڕەگی (ب) بۆ کاتی داهاتوو، کە بەم شێوەیە:

دەبم ـــــ دەبین

دەبیت ـــــ دەبن

دەبێت ـــــ دەبن

**ڕزگار دەبێت بە ئەندازیار.**

کاری ناتەواوە بۆ کاتی داهاتوو

کارە ناتەواوەکان لە ڕووی هێزەوە تێنەپەڕن، بەڵام ئەگەر بە واتای (لەدایکبوون) یان (هەبوون) و (خاوەنداریێتی) بێن، ئەوە لەم حاڵەتانەدا دەبنە کارێکی تەواو، لە ڕووی هێزیشەوە لە هەردوو جۆری تێپەڕ و تێنەپەڕ دەبینرین، هەروەکو:

**ژنەکە** **منداڵی** **بوو.**

بکەر بەرکای ڕاستەوخۆ کاری ڕابوردووی تێپەڕە

**دارەکە** **شین بوو .**

بکەر کاری ڕابوردووی لێکدراوی تێنەپەڕە

**گوزارە:** شتێکە دەدرێتە پاڵ نیهاد، گوزارە هەمیشە کارێکی ناتەواوی لەگەڵدا دێت، واتە دەبێتە تەواوکەری کارەکە.

نموونە// قوتابییەکە زیرەکە. ← کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا

نیهاد گوزارە

**بەرکاری ڕاستەوخۆ:** ناو کاتێك ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆ دەبینێت، ئەگەر هاتوو کاری تێپەڕ لە ڕستەکەدا هەبێت.

نموونە/

**ئازاد** **نامەکەی** **هێنا.**

**تریفە** **نانی** **خوارد.**

بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

**بەرکاری ناڕاستەوخۆ**: ناو کاتێك لە ڕستەدا ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینێت، ئەگەر یەکێك لە پێشبەندەکانی(بە، لە، بۆ، ە) لەپێش بێت، واتە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هێزی کارەکەی دەکەوێتە سەر.

نموونە: **شـــیـــلان چـــوو بـــۆ بـــازاڕ.**

پێشبەند بەرکاری ناڕاستەوخۆ

# جێـنـاو

**یەکەم : جێناو لە ڕووی واتاوە**

**١-جێناوی کەسی**

- **جێناوی کەسی سەربەخۆ**
- **جێناوی کەسی لکاو**

**٢- جێناوی نیشانە**

**٣- جێناوی خۆیی**

**٤- جێناوی هەیی**

**٥- جێناوی هاوبەش**

**٦- جێناوی نەرێنی**

**٧- جێناوی چەندێتی**

**٨- جێناوی دیار**

**٩- جێناوی نادیار**

**١٠- جێناوی پرسیاری**

**١١- جێناوی لێکدەر**

**دووەم: جێناو لە ڕووی پێکهاتنەوە:**

**١- سادە**

**٢- داڕژاو**

**٣- لێکدراو**

**سێیەم : جێناو لە ڕووی ئەرکەوە**

**(بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە،.......)**

# چەمك و پێناسەی جێناو[1]

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی جێناو، هەندێ جار زاراوەکانی (ڕاناو، جێناڤ، ڕاناڤ، بەرناو، بەرناڤ ....هتد) بەکاردێت، کە هەر هەموویان هەمان مەبەست و واتا دەگەیەنن.

جێناو بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە لە جێی ناوی کەسێك یان شتێك دێت، واتە دەبێتە جێگرەوەی ناو. دەتوانین لە سێ ڕوانگەوە لە جێناو بکۆڵینەوە، ئەوانیش جێناو لە ڕووی واتاوە، جێناو لە ڕووی پێکهاتنەوە و جێناو لە ڕووی ئەرکەوە.

**یەکەم : جێناو لە ڕووی واتاوە**

**١- جێناوی کەسی:**

واتای کەسی گیاندار دەگرێتەخۆ، کە ئەوانیش قسەکەر و گوێگر و ئائامادە دەگرێتەوە، جێناوە کەسیەکانیش دوو جۆرن:

أ. **جێناوی کەسی سەربەخۆ:**

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە، کە لە ڕواڵەتدا سەربەخۆن و واتای کەسی گیاندار دەگەیەنن، هەروەها واتای کەسەکە یان کەسەکان نیشان دەدەن و پەیوەندییان بە کەسانی دیکەوە ڕوون دەکەنەوە. لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا یەك کۆمەڵە جێناوی کەسی سەربەخۆمان هەیە، بەم شێوەیە:

---

[1] - بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی بەشە ئاخاوتنی جێناو، بگەڕێوە بۆ: ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٧.

| کەسەکان | | تاك | کۆ |
|---|---|---|---|
| قسەکەر | یەکەم | من | ئێمە |
| گوێگر | دووەم | تۆ | ئێوە |
| ئاناماده | سێیەم | ئەو | ئەوان |

**من دەچم بۆ زانکۆ.**

**ئێمە دەچین بۆ زانکۆ.**

**تۆ دەچی بۆ زانکۆ.**

**ئێوە دەچن بۆ زانکۆ.**

**ئەو دەچێت بۆ زانکۆ.**

**ئەوان دەچن بۆ زانکۆ.**

**من نامەکەم نارد.**

**ئێمە نامەکەمان نارد.**

**تۆ نامەکەت نارد.**

**ئێوە نامەکەتان نارد.**

**ئەو نامەکەی نارد.**

**ئەوان نامەکەیان نارد.**

**ب- جێناوی کەسی لکاو:**

بەو جێناوانە دەوترێت، کە لە ڕواڵەتدا سەربەخۆ نین، بەڵکو بەشێوەیەکی لکاو بە کارێك یان ناوێك دەلکێن. ئەم جێناوانە لە ئاخاوتن و نووسیندا شوێن و جێگەی جێناوە

کەسییە سەربەخۆکان دەگرنەوە. ئەو جێناوانە بە تەنیا هیچ مەبەستێك نە لە ئاخاوتن و نە لەنووسیندا بەدەستەوە نادەن، بەڵام کە لکان بە وشەکانی پێش خۆیانەوە، ئینجا مەبەست دەپێکن.[1] جێناوە لکاوەکان لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا چوار کۆمەڵەن، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**کۆمەڵەی یەکەم:** ئەم کۆمەڵەیە لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕدا بەکاردێت. (م – مان، ت – تان، ی – یان).

| کەسەکان | | تاك | کۆ |
|---|---|---|---|
| قسەکەر | یەکەم | م | مان |
| گوێگر | دووەم | ت | تان |
| ئامادە | سێیەم | ی | یان |

برد

بردم – بردمان

بردت – بردتان

بردی – بردیان

خوارد

خواردم – خواردمان

خواردت – خواردتان

---

١ـ لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دووەمی ناوەندیی، چاپخانەی ئارام، بەغدا، ٢٠٠٧، ل ٤٥.

خواردی – خواردیان

هێنا

هێنام – هێنامان

هێنات – هێناتان

هێنای – هێنایان

**کۆمەڵەی دووەم:** ئەم کۆمەڵەیە لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ بەکاردێت. (م – ین، یت – ن، Ø – ن ).

| کەسەکان | | تاک | کۆ |
|---|---|---|---|
| قسەکەر | یەکەم | م | ین |
| گوێگر | دووەم | یت، ی | ن |
| نائامادە | سێیەم | Ø | ن |

هات

هاتم – هاتین

هاتیت – هاتن

هات – هاتن

کەوت

کەوتم – کەوتین

کەوتیت (کەوتی) — کەوتن

کەوت — کەوتن

خەوت

خەوتم — خەوتین

خەوتیت — خەوتن

خەوت — خەوتن

لەم کۆمەڵەیە، کەسی دووەمی کۆ و کەسی سێیەمی کۆ، هەردووکیان جێناوی لکاوی (ن) وەردەگرن، بۆیە لە ڕستەدا بە هۆی جێناوە کەسییە سەربەخۆکان دەناسرێنەوە، وەکو:

هاتن.

ئەوان هاتن .

ئێوە هاتن .

**کۆمەڵەی سێیەم:** ئەو کۆمەڵەیە لەگەڵ کاری ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕ بەکاردێت.

(م — ین، یت (ی) — ن، ات (ا)، ێت (ێ) — ن).

| کەسەکان | | تاک | کۆ |
|---|---|---|---|
| قسەکەر | یەکەم | م | ین |
| گوێگر | دووەم | یت، ی | ن |
| نائامادە | سێیەم | ات<br>ێت | ن |

چوون

کەوتیت (کەوتی) — کەوتن

کەوت — کەوتن

خەوت

خەوتم — خەوتین

خەوتیت — خەوتن

خەوت — خەوتن

لەم کۆمەڵەیە، کەسی دووەمی کۆ و کەسی سێیەمی کۆ، هەردووکیان جێناوی لکاوی (ن) وەردەگرن، بۆیە لە ڕستەدا بە هۆی جێناوە کەسییە سەربەخۆکان دەناسرێنەوە، وەکو:

هاتن.

ئەوان هاتن .

ئێوە هاتن .

**کۆمەڵەی سێیەم:** ئەو کۆمەڵەیە لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ و تێنەپەڕ بەکاردێت.

(م — ین، یت (ی) — ن، ات (ا)، ێت (ێ) — ن).

| کەسەکان | | تاک | کۆ |
|---|---|---|---|
| قسەکەر | یەکەم | م | ین |
| گوێگر | دووەم | یت، ی | ن |
| نائامادە | سێیەم | ات<br>ێت | ن |

چوون

دەچم — دەچین

دەچیت (دەچی) - دەچن

دەچێت — دەچن

خواردن

دەخۆم — دەخۆین

دەخۆیت (دەخۆی) — دەخۆن

دەخوات — دەخۆن

کردن

دەکەم — دەکەین

دەکەیت — دەکەن

دەکات — دەکەن

ئەگەر ڕەگی کار کۆتایی بە پیتە بزوێنەکانی (ە، ۆ) هاتبێ، ئەوا لەم حاڵەتەدا کەسی سێیەمی تاك (ات- ا) وەردەگرێ. لەم حاڵەتەشدا دوو گۆڕانکاری ڕوودەدات، یەکەکیان پیتی بزوێنی (ە) تێدەچێت، ئەویتریان پیتی بزوێنی (ۆ) دەبێتە (و)ی نەبزوێن، ئەمیش بۆ ئاسانی دەربڕین، وەك ئەمانەی خوارەوە:

| چاوگ | ڕەگی کار | کاری ڕانەبوردوو |
|---|---|---|
| خواردن | خۆ | دەخوات |
| شوشتن | شۆ | دەشوات |
| کردن | کە | دەکات |
| بردن | بە | دەبات |

جیاوازی کۆمەڵەی دووەم و کۆمەڵەی سێیەم لە کەسی سێیەمی تاکدا دەردەکەوێت، چونکە بۆ کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ لە کەسی سێیەمی تاک، مۆرفیمی (سفر)ە و دەرناکەوێت، بەڵام بۆ کاری ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕ، ئەوە جێناوەکانی ( ات (ا)، ێت (ێ) ) وەردەگرێت .

**کۆمەڵەی چوارەم:** ئەم کۆمەڵەیە لەگەڵ کاری فەرماندان بەکاردێت.

| کەسەکان | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | — | — |
| دووەم | ە | ن |
| سێیەم | — | — |

دانیشتن

دانیشە — دانیشن

خواردن

بخۆ — بخۆن

خوێندن

بخوێنە ـ بخوێنن

هەندێ جار جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاک دەرناکەوێت، بەتایبەتی کاتێ ڕەگی کار کۆتایی بە پیتی بزوێنی (ە، ۆ) دێت، وەکو:

شوشتن ←—— بشۆ     کردن ←—— بکە

هەروەها چاوگی (چوون) ئەگەرچی ڕەگی کارەکەی (چـ)ە، کە پیتێکی نەبزوێنە، بەڵام هەمدیسان جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك (ە) دەرناکەوێت، وەکو:

چوون ـــــ چـ ـــــ بچۆ

### ٢. جێناوی نیشانە:

بەو جێناوانە دەوترێت کە لە جێی ناوی کەسێك یان شتێك دادەنرێت و دەست نیشانی دەکات. جێناوەکانی نیشانەش لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا بەم شێوەیە خوارەوەن: [1]

ئەمە ................ بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ئەوە ................ بۆ تاکی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

ئەمانە ............... بۆ کۆی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ئەوانە ............... بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

**ئەمە زیرەکە.**

**ئەوە جوانە.**

**ئەمانە نەوەی دوارۆژن.**

**ئەوانە نەهاتوون.**

---

(١) لە شێوەی ئاخاوتنی هەولێر ( شێوەی سۆرانی )، جێناوەکانی نیشانە بەم شێوەیەی خوارەوەن:

ئەوە ................ بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ئەوێهێ................ بۆ تاکی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

ئەوانە............... بۆ کۆی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ئەوانێهێ............... بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

هەندێکجار جێناوی نیشانە شێوەی خۆیان دەگۆڕن، بەتایبەتی کاتێك لەگەڵ پێشبەندەکان یەك دەگرن. وەکو:

لە + ئەمە = لەمە

بە + ئەوە = بەوە

لە + ئەمانە = لەمانە

لە + ئەوانە = لەوانە

**لەمەوە بۆمان دەرکەوت.**

جێناوی نیشانە

لە + ← ئەمە + دوە

پێشبەند جێناوی نیشانە پاشگری دووبارە

**٣. جێناوی خۆیی:**

جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە، کە خاوەنییەتی و خاوەنداری دەگەیەنێت. فۆرمی سەرەکی جێناوی خۆیی لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا (خۆ)یە؛ کە بۆ هەر سێ کەسەکانی یەکەم (قسەکەر)، دووەم (گوێگر)، سێیەم (نانامادە) بەکاردێ، بەم شێوەیەی خوارەوە:

خۆم - خۆمان

خۆت - خۆتان

خۆی - خۆیان

**خۆم دەچم بۆ زانکۆ.**

جێناوی خۆیی بۆ کەسی یەکەمی تاك

**خۆی دەچێت بۆ زانکۆ.**

جێناوی خۆیی بۆ کەسی سێیەمی تاك

**خودی خۆم ئەم کارەم ئەنجامدا.**

جێناوی خۆیی

هەندێ جار (خود)ش وەکو جێناوێکی خۆیی بەکاردێت، وەکو:

**خودی خۆی ئەو کارەی ئەنجامداوە .**

جێناوی خۆیی لە ڕووی ڕەگەز و ژمارە و دۆخەوە بێلایەنە . لە هەمان کاتیشدا دەشێ جێناوی خۆیی (خۆ) لە ڕستەدا بە تەنیا دەرکەوێت، وەکو:

**ئێمە دوێنێ ئێوارە لە پارکی شانەدەر خۆ بە خۆ دانیشتبووین .**

جێناوی خۆیی جگە لەوەی لەگەڵ جێناوە لکاوەکان دەردەکەێت، هەروەها لەگەڵ مۆرفیمی(ش،یش)ی جەختکردنیش دەردەکەوێت، وەکو:

خۆشم – خۆشت – خۆشی – خۆشمان – خۆشتان - خۆشیان

**٤.جێناوی هەیی:**

جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە، کە واتـای خاوەنداریـەتی دەگەیـەنێ، و خاوەنەکەشی دەشێ ناو بێ یان جێناو و لەنێو ڕستەدا ئەرکی ناوەکـە یـان جێناوەکـەی پـێ دەسپێردرێ. لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا هەردوو فۆرمی (ئی، هی) بۆ جێنـاوی هەیی بەکاردێن.وەکو:

**ئـەم کـتـێبە ئی مـنە.**

**پێنووسەکە هی تۆیە.**

**٥ـ جێناوی هاوبەش:**

بەو جێناوانە دەوترێ، کە هاوبەشی لەنێوان دووکەس یان دوو شت دروست دەکات، فۆرمی جێناوی هاوبەش بریتییە لە (یەك) و (تر) لەگەڵ یەکدی دەبێتە (یەکتر)،جگە لەو فۆرمە دەتوانین (یەکدی، یەکدوو)ش بەکاربێنین، هەروەکو:-

**سـکالاّ بـۆ یـەکدی دەنێرین.**

**وتارەکان بۆ یەکتر دەنووسینەوە.**

**٦- جێناوی نەرێنی (نەفی):**

بەو جێناوانە دەوترێت کە نەرێنی کەسێك یان شتێك ڕادەگەیەنێت، فۆرمی نەرێنی لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا پێکدێت لە (چ – هیچ). ئەگەرچی هەندێ جار ئەم جێناوە بە تەنیا نایەت، بەڵکو لەگەڵ کەرەستەیەکی تر دێت، وەك (کەس، کەسێ، کەسێك، شت، شتێ، شتێك، یەك، یەکێ، یەکێك)، وەکو:-

**هیچ کەس نەهاتووە.**

**چ شتێکم نەبینیوە.**

**٧-جێناوی چەندێتی:**

بەو جێناوانە دەوترێت کە ڕێژەی کەسەکان یاخود شتەکان دیاری دەکات و واتای چەندێتی و پرسیار دەبەخشێ. فۆرمەکانی جێناوی چەندێتی بریتییە لە (چەند، چەندە، چەندی، هێندە، هێندی، ئەوەندە، ئەمەندە .....) .

**ئەمەندەم ماوەتەوە.**

**٨- جێناوی دیار:**

بەو جێناوانە دەوترێت کە ژمارەی کەسەکان یان شتەکان لە ڕستە و دەقدا دیاری دەکەن. بە واتایەکی تر ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە لە جێگەی کەسێکی دیار و ئاشکرا و زانراو بەکاردێن، فۆرمەکانی جێناوی دیار بریتین لە (هەموو، گشت، هەر، تەواو)، هەندێ جار ئەم فۆرمانە لەگەڵ کەرەستەی تردا دێن، واتە ( هەموو کەسێك، هەموو شتێك، هەر کەسێك،...). وەك:

**هەموویان ئامادەبوون.**

جێناوی دیار

**گشتیان دەرچوون.**

جێناوی دیار

**٩- جێناوی نادیار:**

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە، کە لە بری ناوی کەسێك یا گیانداریێك یا هەر شتێکی تر بەکار دەهێنرێت، بەڵام ئەم ناوە بەئاشکرایی دیار نییە کە کێیە و چییە، بە واتایەکی تر بەو جێناوانە دەوترێت کە لە شوێنی کەسێك یان شتێکی نادیار دێن. فۆرمەکانی جێناوی نادیاریش بریتین لە (فلان، فیسار، کابرا، هین، کەسێك، شتێك، یەکێ، یەکێك ...هتد).وەك:

**فلان کارەکەی ئەنجامدا.**

جێناوی نادیار

**ئەمڕۆ یەکێك خۆی کوشت .**

جێناوی نادیار

**١٠- جێناوی پرسیاری:**

بەو جێناوانە دەوترێ کە پرسیار لە کەسێك یان شتێك یا کاتێك یاخود ڕووداوێك دەکەن. فۆرمی جێناوی پرسیاری بریتییە لە (کێ، کام، کامە، کامیان، کامەیان، بۆ، چەند، لەکوێ ... هتد). وەکو:

**کێ نەهاتووە ؟**

جێناوی پرسیاری

**کامە گوڵ جوانە؟**

جێناوی پرسیاری

**١١- جێناوی لێکدەر:**

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە کە لە جیاتی ناوی کەسێك یان شتێك بەکاردەهێنرێت، کە پێشتر گوترابێ، هەروەها دوو ڕستەش پێکەوە دەبەستێت و بەیەکەوە ڕستەیەکی ئاڵۆز (تێکەڵ) سازدەکەن. هەمیشە جێناوی لێکدەر وەکو کەرەسەیەکی پەیوەستدار بە پاڕستەی نێو ڕستەکە هەژمار دەکرێت، چونکە ڕستەی ئاڵۆز لە شاڕستە و پاڕستە پێك دێت. فۆرمەکانی جێناوی لێکدەریش بریتین لە (کە، ی کە)، وەکو:

**هەولێر کە پایتەختی کوردستانە، شارێکی خۆشە.**

**ئەو قوتابییەی کە نەهاتبوو، دەرکرا.**

**دووەم : جێناو لە ڕووی پێکهاتنەوە**

١- **جێناوی سادە:** لە یەك وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکدێت، وەکو (کێ، کام، ئەو، ی، هی، ئی...هتد) .

٢- **جێناوی داڕێژاو:** لە وشەیەکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یاخود پاشگرێك یاخود پێشگر و پاشگر پێکدێت، وەکو (ئەمە، ئەوە، ئەمانە، ئەوانە، کامە، کامەیە،... هتد).

٣- **جێناوی لێکدراو:** لە دوو وشەی واتادار یاخود زیاتر پێکدێت، وەکو (هەموو شتێك، هەموو کەسێك، هەر کەسێك،... هتد).

## سێیەم : جێناو لە ڕووی ئەرکەوە

بەشە ئاخاوتنی جێناو دەتوانێ لە ڕستەدا ئەرك ببینێت، واتە ببێتە (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە، تەواوکەری ناو، تەواوکەری کاری ناتەواو...).

**ئەرکی بکەر: من نان دەخۆم.**

**ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆ: من ئەوم بینی.**

**ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆ: بەتۆ دەڵێم.**

**ئەرکی نیهاد: خۆی جوانە.**

**ئەرکی گوزارە: نامەکە هی ئەمانەیە.**

# ئاوەڵناو

## جۆرەکانی ئاوەڵناو

١- ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە:

- ئاوەڵناوی چۆنیەتی
- ئاوەڵناوی نیشانە
- ئاوەڵناوی نسبی
- ئاوەڵناوی نادیار

٢- ئاوەڵناو لە ڕووی پلەوە:ـ

- پلەی چەسپاو
- پلەی بەراورد
- پلەی باڵا

٣- ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە:

- ئاوەڵناوی سادە
- ئاوەڵناوی داڕژاو
- ئاوەڵناوی لێکدراو

٤ـ ئاوەڵناو لە ڕووی ئەرکەوە:

- دیارخەری ناو
- دیارخەری جێناو
- دیارخەری ئاوەڵناو
- دیارخەر و تەواوکەری کاری ناتەواو

**چەمك و پێناسەی ئاوەڵناو:**

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی ئاوەڵناو، ئەوە زاراوەکانی (هاوەڵناو، هەڤلناڤ، هاوەڵناڤ، سیفە .....) بەکاردێن. ئاوەڵناویش بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە وەسفی ناوێك یاخود جێناوێك دەکات، بەهۆیەوە دەبێتە تەواوکەری ناوێك یان جێناوێك یان ئاوەڵناوێکی تر یان تەواوکەری کارێکی ناتەواو.

ئاوەڵناو پەیوەستە بە ناو و جێناوەوە، واتە دۆست و هاوڕێی ناو و جێناوە لە ڕستەدا. ئاوەڵناویش هەروەکو ناو و ئاوەڵکار هیچ نیشانەیەکی مۆرفۆلۆژی نییە، بۆ ئەوەی لە ڕووی ڕوخسارەوە دیاری بکرێت، بەڵکو دیاریکردنی ئاوەڵناو لە ڕستەدا پەیوەستە بە واتاوە.

## جۆرەکانی ئاوەڵناو

**١. ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە[1]:**

**أ. ئاوەڵناوی چۆنیەتی:**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە چۆنیەتی و خاسیەت و نیشانە دەگەیەنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاوەڵناوی چۆنیەتی هەمەجۆرە، لەوانە واتای ڕەنگ نیشان دەدات ( زەرد، شین سوور، سپی...)، چەمکی دەوروبەر ڕادەگەیەنێ (ڕاست، چەپ...)، یاخود سیفەت نیشان دەدات (ڕەزیل، ڕووخۆش...)، یاخود شێوە دەردەبڕێ (قەڵەو، پان، بەرین، لاواز....).

---

[1] - بۆ شارەزابوون لەم بابەتە، بگەڕێوە بۆ: ئەوڕەحمانی حاجی مارف(د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی سێیەم (ئاوەڵناو)، کۆڕی زانیاری عێراق/ دەستەی کورد، بەغدا، ١٩٩٢.

لە بابەتی ئاوەڵناودا بە گشتی و ئاوەڵناوی چۆنیەتی بەتایبەتی، ئامرازی دانەپاڵی (ی) و هەندێ جار ئامرازی دانەپاڵی (ە) ڕۆڵێکی دیار دەبینن لە خستنەپاڵی ناوێك یا جێناوێك لەگەڵ ئاوەڵناوێك، وەکو:

**پیاوی دەشتەکی بەهێزە.**

پیاو: ناو

ی : ئامرازی دانەپاڵ

دەشتەکی: ئاوەڵناوی نسبی

بەهێز: ئاوەڵناوی چۆنیەتی

**قوتابیی زیرەك سەردەکەوێت.**

قوتابی: ناو

ی : ئامرازی دانەپاڵ

زیرەك: ئاوەڵناوی چۆنیەتی

**ئێوەی تێکۆشەر سەربەرزن.**

ئێوە: جێناوی سەربەخۆ

ی: ئامرازی دانەپاڵ

تێکۆشەر: ئاوەڵناوی چۆنیەتی

سەربەرز: ئاوەڵناوی چۆنیەتی

**ب. ئاوەڵناوی نیشانە:**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە دەستنیشانی ناوی کەسێك یان شتێك لە ڕستەدا دەکەن. ئاوەڵناوەکانی نیشانە هەمیشە دەبنە دوو پارچە، پارچەیەکیان دەکەوێتە پێش ناوەکە و پارچەکەی تریان دەکەوێتە دوای ناوەکە، ئەم دوو پارچەیە دەبنە دیارخەر بۆ

ناوەکە، هەر بۆیە هەر ناوێك بە ئاوەڵناوی نیشانە دەستنیشان بکرێت، ئەوە دەبێتە ناوێکی ناسراو. ئاوەڵناوەکانی نیشانە لە زاری کرمانجی ناوەڕاستدا بریتین لە:

ئەم..... ە    بۆ تاکی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ئەو...... ە    بۆ تاکی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

ئەم ....انە    بۆ کۆی نێر و مێی نزیك بەکاردێ.

ئەو.....انە    بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە بەراورد لە نێوان جێناوی نیشانە و ئاوەڵناوی نیشانە بکەین :

| جێناوی نیشانە | ئاوەڵناوی نیشانە |
| --- | --- |
| **١- جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە .** | **١- جۆرێکە لە جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە .** |
| **٢-هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێ (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە....).** | **٢- تەنیا ئەرکی دیارخەری ناو دەبینێ.** |
| **٣- هەمیشە لە جێی ناو دێ.** | **٣- هەمیشە لەگەڵ ناو دێ، بەهۆیەوە ناوەکەش دەبێتە ناوێکی ناسراو .** |
| **٤- لە ناو ڕستەدا لە شێوەی یەك پارچەدا دێ.** | **٤- لە ناو ڕستەدا ئاوەڵناوی نیشانە دەبێتە دوو پارچە، پارچەیەکیان دەکەوێتە پێش ناو و پارچەکەی تریان دەکەوێتە دوای ناوەکە** |

نموونە بۆ ئاوەڵناوی نیشانە:

**ئەم کوڕە زیرەکە.**

**ئەو کچە جوانە.**

**ئەم کوڕانە نەوەی دوارۆژن.**

**ئەو گوڵانە بکڕە.**

**ج. ئاوەڵناوی نسبی:**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت، کە واتاکەیان بەستراوەتەوە بە وشەیەکی ترەوە، واتە ڕاستەوخۆ مەبەستەکە دیاری ناکات، بەڵکو لە ڕێگەی پەیوەندی بە وشەیەکی ترەوە واتاکەی دەردەکەوێت.

جیاوازی ئاوەڵناوی نسبی لەگەڵ ئاوەڵناوی چۆنیەتی لەوەدایە، کە هەموو ئاوەڵناوێکی نسبی داڕژاون، واتە ناسادەن، بەڵام ئاوەڵناوی چۆنیەتی زۆربەیان لە جۆری سادەدان.

ئەو پاشگرانەی کە بۆ دروستکردنی ئاوەڵناوی نسبی لە زمانی کوردیدا بەکاردێن، بریتین لە: (ی، ین، ە، انە، ەکی)، وەکو:

(ی): کرمانجی، عێراقی، هەولێری... هتد.

(ین): بەردین، ئاشین، زێڕین... هتد.

(ە): هاوینە، زستانە، پایزە، بەهارە... هتد.

(انە): پیاوانە، ژنانە... هتد.

(ەکی): دەشتەکی، خێڵەکی،...هتد.

**د. ئاوەڵناوی نادیار:**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە ڕاستەوخۆ دەلالەت لە شتێکی دیاریکراو ناکەن، بەڵکو واتاکەی بە چوارچێوەیەکی دیاریکراوەوە بەستراوەتەوە.

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر ئاوەڵناوی نادیارمان هەیە:

**١. ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوە:** ئەو کەرەسانەی کە بۆ ئاوەڵناوی جیاکەرەوە بەکاردێن، بریتین لە( دی، دیکە، تر، کە)، هەندێ جار ئەو ئاوەڵناوانە (ئی، یەك) لەگەڵیان دێت، ئەم هاوەڵناوانە دەتوانن لە ڕستەدا لەبری یەکتر بەکاربهێنرێن،وەك:

ئی + دی = ئیدی

ئی + دیکە = ئیدیکە

یەك + دیکە = یەکدیکە

**لەگەڵ پیاوی دی کار دەکەم.**

**پێویستم بە کەسی دیکە نییە.**

**٢. ئاوەڵناوی نادیاری دیاریکردن:** ئەو کەرەسانەی کە بۆ ئاوەڵناوی نادیاری دیاریکردن بەکاردێن، بریتین لە (وا، ئاوا، وەها، ئاوها، ئەوها ......) .

**ـ کچێکی وام بینی، کە هەر وەسفی ناکرێت.**

**ـ نازدار کچێکی ئاوایە.**

**٢. ئاوەڵناولە ڕووی پلەوە:**

**أ. ئاوەڵناوی پلەی چەسپاو:**

ئەو ئاوەڵناوانە دەگرێتەوە کە بەراورد لە نێوان هیچ کەس و شتێك ناکات، بەڵکو تەنیا پلەی نەگۆڕ و چەسپاوی ناوەکە یاخود جێناوەکە دەخاتە ڕوو، واتە تەنیا وەسفی

ناوەکە یاخود جێناوەکە دەکات و، دەبێتە تەواوکەری نـاو یـان جێنـاو یـان کـاری ناتـەواو، وەکو (باش، خراپ، جوان، زیرەك، ئازا، خێرا، ....).

**ڕزگار زیرەکە.**

**سۆزان جوانە.**

**سۆران ئازایە.**

**ب. ئاوەڵناوی پلەی بەراورد:**

ئەو ئاوەڵناوانە دەگرێتەوە کە بەراورد لە نێوان دوو کـەس یـان دوو شـت دەکـەن، بـە جۆرێك یەکێکیان بە باشتر و چاکتر دادەنێ لە ئەویتریان. یاساکەی بەم شێوەیە:

**چەسپاو + تر = ئاوەڵناوی پلەی بەراورد**

باش + تر = باشتر

چاك + تر = چاکتر

زیرەك + تر = زیرەکتر

**شیلان لە ئاواز زیرەکترە.**

**ج. ئاوەڵناوی پلەی باڵا:**

ئەو ئاوەڵناونە دەگرێتەوە، کە بەراورد لە نێوان کەسێك لەگەڵ کۆمەڵـە کەسـێك یـان شتێك لەگەڵ کۆمەڵە شتێك دەکەن.

دەستوورەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**١. چەسپاو + ترین = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

باش + ترین = باشترین

چاك + ترین = چاکترین

**٢. بەراورد + ین = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

باشتر + ین = باشترین

چاکتر + ین = چاکترین

**٣. لەهەموو، لەگشت، لەتێکڕا + بەراورد = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

**ئاواز لە هەموو کچەکان جوانترە.**

**٤. هەرە + چەسپاو = ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

**کامەران قوتابی هەرە زیرەکی پۆلەکەیەتی.**

**٣. ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە:**

ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە پێکدێت لە:

**١ـ ئاوەڵناوی سادە:ـ**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت، کە لە یەك وشەی واتاداری سەربەخۆ پێك دێن، وەکو: (جوان، پاك، زیرەك، سوور، لێژ، خراپ، باش، بەرز، قورس،...هتد).

**ڕزگار زیرەکە.**

**نازدار جوانە.**

**٢ـ ئاوەڵناوی دارِژاو:ـ**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە لە وشەیەکی سادە و پێشگرێك، یاخود پاشگرێك یاخود هەردووکیان پێك دێت.

یاساکانی سازکردنی ئاوەڵناوی دارِژاویش بەم شێوەیەی خوارەوەن:ـ

**أ ـ پێشگر + ناو = ئاوەڵناوی دارِژاو**

بێ + کار = بێکار

بێ + هۆش = بێهۆش

بێ + هێز = بێهێز

بە + هێز = بەهێز

بە + جەرگ = بەجەرگ

**ب ـ ناو + پاشگر (ی، ین، ن، ۆڵ، ەوەر، دار، انە، انی، ەکی...هتد) = ئاوەڵناوی داڕژاو**

جیهان + ی = جیهانی

زێڕ + ین = زێڕین

شەرم + ن = شەرمن

کرم + ۆڵ = کرمۆڵ

بەخت + ەوەر = بەختەوەر

پیاو + انە = پیاوانە

کوڕ + انی = کوڕانی

خێڵ + ەکی = خێڵەکی

ترس + ناك = ترسناك

هاوین + ە = هاوینە

فێڵ + باز = فێڵباز

سوود + مەند = سوودمەند

غەم + گین = غەمگین

درۆ + زن = درۆزن

**جـ ـ پێشگری (نە، نا) + ئاوەڵناوی سادە = ئاوەڵناوی داڕژاو**

نە + خۆش = نەخۆش

نە + ساغ = نەساغ

نا + پاك = ناپاك

نا + خۆش = ناخۆش

**دـ ئاوەڵناوی سادە+پاشگر (انی، ا، ۆکە، ەڵە، ۆڵە، یل، کەلە، کیلە، لکە، اك) = ئاوەڵناوی داڕژاو**

تەخت + انی = تەختانی

ڕەق + انی = ڕەقانی

پیس + ۆکە = پیسۆکە

ترش + ۆکە = ترشۆکە

سەوز + ەڵە = سەوزەڵە

باریك + ەلە = باریکەلە

نەرم + ۆڵە = نەرمۆڵە

ورد + ۆڵە = نەرمۆڵە

ورد + یل = وردیل

جوان + کەلە = جوانکەلە

جوان + کیلە = جوانکیلە

بەرز + ۆڵکە = بەرزۆڵکە

سپی + لکە = سپیلکە

ڕوون + اك = ڕووناك

**هـ ـ پێشگر + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی داڕژاو**

نە + مر = نەمر

بـ + وێر = بوێر

بـ + کوژ = بکوژ

**وـ ڕەگی کار + پاشگر = ئاوەڵناوی داڕژاو**

نووس + ەك = نووسەك

گەڕ + ۆك = گەڕۆك

زان + ا = زانا

**ز ـ ئاوەڵکاری سادە + پاشگر = ئاوەڵناوی داڕژاو**

سەر + ەکی = سەرەکی

**٣ـ ئاوەڵناوی لێکدراو:**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت، کە لە وشەیەك یان زیاتر پێك دێت. یاساکانی سازکردنی ئاوەڵناوی لێکدراویش بەم شێوەیەی خوارەودن:

**١ـ ناو + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

گەردن + بلوور = گەردن بلوور

بەژن + چنار = بەژن چنار

**٢ـ ناو + ئاوەڵناوی سادە = ئاوەڵناوی لێکدراو**

ڕوو + خۆش = ڕووخۆش

دڵ + تەنگ = دڵتەنگ

دەست + درێژ = دەستدرێژ

بەخت + ڕەش = بەخت ڕەش

**٣ـ ناو + ناوی بەرکار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

سەر + شکاو = سەرشکاو

دڵ + سووتاو = دڵسووتاو

**٤ـ ناو + بە + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

قوڕ + بە + سەر = قوڕبەسەر

ڕوو + بە + خاڵ = ڕووبەخاڵ

**٥ـ ئاوەڵناوی سادە + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

خۆش + باوەڕ = خۆش باوەڕ

پڕ + سوود = پڕسوود

**٦ـ ئاوەڵناوی سادە + ە + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

کورت + ە + باڵا = کورتەباڵا

پیر + ە + مێرد = پیرەمێرد

**٧ـ ناو + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

ئاشتی + خواز = ئاشتیخواز

سەر + بەست = سەربەست

پیاو + کوژ = پیاوکوژ

**٨ـ ئاوەڵناوی سادە + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

دوور + بین = دووربین

ڕەش + پۆش = ڕەشپۆش

ڕاست + گۆ = ڕاستگۆ

**٩ـ ژمارە + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

دوو + دڵ = دوودڵ

چوار + چاو = چوارچاو

**١٠ـ ئاوەڵکاری سادە + ب + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

زۆر + بڵێ = زۆربڵێ

**١١ـ ئاوەڵکاری سادە + ڕەگی کار + پاشگری (ەر) = ئاوەڵناوی لێکدراو**

کەم + خۆ + ەر = کەمخۆر

**٤- ئاوەڵناو لە ڕووی ئەرکەوە**

ئاوەڵناو دەتوانێ لە ڕستەدا ئەرك ببینێت، بەڵام ناتوانێ هەموو ئەرکێك لە ڕستەدا ببینێت، چونکە ئەرکەکانی دیاریکراوە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەن:

**١- ئاوەڵناو دەبێتە دیارخەری ناو، وەکو:**

ئەم ........ە دیارخەر

**ئەم گوڵە بکڕە.**

ئەو ......ە دیارخەر

**کوڕێکی زیرەك هات.**

**٢- دەبێتە تەواوکەر و دیارخەری جێناو، وەکو:**

**ئێوەی تێکۆشەر سەردەکەون.**

**٣- دەبێتە دیارخەر و تەواوکەری کاری ناتەواو، وەکو:**

**ڕزگار زیرەکە.**

**ژوورەکە پاکە.**

**٤- دەبێتە دیارخەری ئاوەڵناوی تر، وەکو:**

**کچێکی باڵابەرزی چاوشین هات.**

# چاوگ

چەمك و پێناسەی چاوگ

یەکەم: چاوگ لە ڕووی پێکهاتنەوە

أ ـ چاوگی سادە

ب ـ چاوگی داڕژاو

ج ـ چاوگی لێکدراو:

دووەم: نیشانەی چاوگ

سێیەم : قەدی چاوگ:

چوارەم : قەدی چاوگ و ڕەگی کار

پێناسەی ڕەگ

جۆرەکانی ڕەگ

١ـ ڕەگی ڕابوردوو(قەدی چاوگ)

٢ - ڕەگی ڕانەبوردوو

یەکەم: چاوگی(تەلفی)

دووەم: چاوگی( یائی)

سێیەم: چاوگی (واوی)

چوارەم: چاوگی (تائی)

پێنجەم : چاوگی(دالی)

# چاوگ

## چەمك و پێناسەی چاوگ

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی چاوگ، زاراوەکانی( ژێدەر، سەرچاوە، مەسدەر،... هتد) بەکاردێن. چاوگ وشەیەکە یا سەرچاوەیەکە بۆ دروستکردنی کاری ڕابوردوو و ناو، کە لە ڕستەدا کردەوەیەك پیشان دەدات، بەڵام ئەم کردەوەیە ناخرێتەپاڵ کەسێك یان شتێك، ژمارە و کاتیشی تێدا نییە.

## پۆلێنکردنی چاوگ

### یەکەم: چاوگ لە ڕووی پێکهاتنەوە

لە ڕووی پێکهاتنەوە چاوگ دەبێتە سێ جۆرەوە:

**أ ـ چاوگی سادە:**

لە وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ پێکدێت و بە (ن) کۆتایی دێت، وەکو: (مردن، سووتان، ڕووخان، کەوتن، خەوتن......).

**ب ـ چاوگی دارِژاو:**

لە چاوگێکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یان پاشگرێك یان هەردووکیان پێکدێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١ـ پێشگر + چاوگی سادە = چاوگی دارِژاو**

ڕۆ + چوون = ڕۆچوون

دا + خستن = داخستن

بەر + دان = بەردان

تێ + کردن = تێکردن

**٢ـ چاوگی سادە + پاشگر = چاوگی داڕژاو**

بردن + ەوە = بردنەوە

شکان + اندن = شکاندن

**٣ـ پێشگر + چاوگی سادە + پاشگر = چاوگی داڕژاو**

تێ + کردن + ەوە = تێکردنەوە

بەر + دان + ەوە = بەردانەوە

**ج ـ چاوگی لێکدراو:**

بەو چاوگانە دەوترێت کە لە دوو وشە یان زیاتر پێک دێت، بەمەرجێ وشەیەکیان چاوگ بێ. یاساکانی سازکردنی چاوگی لێکدراویش بەمشێوەیەی خوارەوەن:

**١ـ ناوی سادە + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

دەست + کەوتن = دەستکەوتن

شەڕ + کردن = شەڕکردن

یارمەتی + دان = یارمەتیدان

**٢ـ ناوی داڕژراو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

گەرما + بوون = گەرمابوون

چلکاو + خواردن = چلکاو خواردن

ڕێگا + گرتن = ڕێگاگرتن

**٣ـ ناوی لێکدراو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

ماستاو + خواردن = ماستاوخواردن

ماڵئاوایی + کردن = ماڵئاوایی کردن

**٤ـ دووبارەکردنەوەی ناو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

کون کون + کردن = کون کون کردن

کون کون + بوون = کون کون بوون

**٥ـ ناوی دارِژاو + چاوگی دارِژاو = چاوگی لێکدراو**

جێگە + کردنەوە = جێگەکردنەوە

چلکاو + خواردنەوە = چلکاو خواردنەوە

**٦ـ ناوی سادە + چاوگی دارِژاو = چاوگی لێکدراو**

دەست + هەڵبڕین = دەست هەڵبڕین

چاو + پێ کەوتن = چاوپێکەوتن

**٧ـ فریزی ناوی + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

لەهۆش + چوون = لەهۆش چوون

لەبیر + کردن = لەبیرکردن

**٨ـ فریزی ناوی + چاوگی دارِژاو = چاوگی لێکدراو**

بەبیر + هاتنەوە = بەبیرهاتنەوە

لەبیر + کردنەوە = لەبیرکردنەوە

**٩ـ ئاوەڵناوی سادە + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

بڵند + کردن = بڵندکردن

خۆش + کردن = خۆشکردن

**١٠ـ ئاوەڵناوی داڕژاو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

بەهێز + کردن = بەهێزکردن

نەخۆش + کەوتن = نەخۆش کەوتن

**١١ـ ئاوەڵناوی لێکدراو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

دڵخۆش + کردن = دڵخۆشکردن

دڵشاد + بوون = دڵشادبوون

ڕوو ڕەش + کردن = ڕووڕەشکردن

**١٢ـ دووبارەکردنەوەی ئاوەڵناو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

ورد ورد + کردن = وردوردکردن

ورد ورد + بوون = ورد وردبوون

**١٣ـ ئاوەڵناوی سادە + چاوگی داڕژاو = چاوگی لێکدراو**

نوێ + کردنەوە = نوێکردنەوە

تیژ + کردنەوە = تیژکردنەوە

**١٤ـ ئاوەڵناوی داڕژاو + چاوگی داڕژاو = چاوگی لێکدراو**

بەهێز + بوونەوە = بەهێزبوونەوە

**١٥ـ ئاوەڵناوی لێکدراو + چاوگی داڕژاو = چاوگی لێکدراو**

دڵسارد + کردنەوە = دڵساردکردنەوە

دڵخۆش + کردنەوە = دڵخۆشکردنەوە

**١٦ـ ئاوەڵکاری سادە + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

زۆر + کردن = زۆرکردن

کەم + کردن = کەمکردن

**١٧ـ ئاوەڵکاری دارِژاو + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

لەناو + چوون = لەناوچوون

لەناو + بردن = لەناوبردن

**١٨ـ وشەیەك مانای سەربەخۆی نەبێت + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

واز + هێنان = وازهێنان

نقووم + بوون = نقووم بوون

**١٩ـ ئامرازی سەرسوڕمان + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

داخ + خواردن = داخخواردن

ئاخ + خواردن = ئاخخواردن

**٢٠ـ ئامرازی سەرسوڕمان + چاوگی دارِژاو = چاوگی لێکدراو**

ئاخ + هەڵکێشان = ئاخ هەڵکێشان

**٢١ـ پارتیکل + چاوگی سادە = چاوگی لێکدراو**

خۆزگە + خواردن = خۆزگە خواردن

**دووەم: نیشانەی چاوگ**

لە زمانی کوردیدا چاوگ بە (ن) کۆتایی دێت، ئەم نوونەش لەگەڵ ئەم پێنج پیتانە (وو، ی، د، ا، ت)دێت و بە یەکەوە (نیشانەی چاوگ) پێکدەهێنن؛ کەواتە

مۆرفیمی پێش (ن) و (ن)ی چاوگ بەیەکەوە دەبنە نیشانەی چاوگ، ناوی ئەم نیشانانەی چاوگیش بە پیتەکەی پێش خۆیەوە بەندە، بەمشێوەی خوارەوە:

چاوگی واوی(وون): چوون، بوون..............

چاوگی یائی(ین): کڕین، فڕین..............

چاوگی دالی(دن): کردن، بردن..............

چاوگی ئەلفی(ان): سووتان، شکان............

چاوگی تائی(تن) : کەوتن، خەوتن.............

**سێیەم : قەدی چاوگ:**

به لابردنی (ن)ی چاوگ، قەد دروست دەبێت، جگە لە قەدی چاوگ، زاراوە و حاڵەتی تریش دەگرێتەخۆ، وەکو (بناغەی چاوگ، ڕەگی ڕابوردوو، ڕابوردووی نزیک)، کەواتە دەتوانرێ لەم هێلکارییەی خوارەوە زیاتر ڕوونی بکەینەوە:

**قەدی چاوگ = بناغەی چاوگ = رابوردووی نزیك = ڕەگی ڕابوردوو**

هەروەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

| چاوگ | (قەدی چاوگ، بناغەی چاوگ، ڕابوردووی نزیك، ڕەگی ڕابوردوو) |
|---|---|
| هێنان | هێنا |
| شکان | شکا |
| بردن | برد |
| خواردن | خوارد |
| سووتان | سووتا |
| ڕژان | ڕژا |
| دزین | دزی |

کڕین     کڕی
شوشتن     شوشت
کەوتن     کەوت

## چوارەم : قەدی چاوگ و ڕەگی کار

لە زمانی کوردیدا زمانەوانان هەردوو زاراوەی قەد و ڕەگ بەکاردێنن، بەهۆیەوە (قەد) دەیبەستنەوە بە کاری ڕابوردوو، و(ڕەگ)یش دەیبەستنەوە بە کاری ڕانەبوردوو، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا هەندێ زمانەوانانی تر (ڕەگ) بۆ ڕابوردوو و ڕانەبوردوو بەکاردێنن، واتە (ڕەگی ڕابوردوو) و (ڕەگی ڕانەبوردوو) بەکاردێنن.

## پێناسەی ڕەگ

ئەو بەشەیە کە لە چاوگ وەردەگیرێت و، دەبێتە بەشێك لە پێکهاتەی چاوگ، لەهەمان کاتیشدا بەشی هەرە زۆری ڕەگی کار وەکو مۆرفیمێکی بەند سەیردەکرێ و بە تەنیا بەکارنایێت.

## جۆرەکانی ڕەگ

### ١ـ ڕەگی ڕابوردوو(قەدی چاوگ):

ئەو ڕەگەیە؛ کە بە لابردنی (ن)ی چاوگ دروست دەبێت. لە زمانی کوردیدا هەموو ڕەگەکانی ڕابوردوو بە یەکێ لەم پێنج مۆرفیمە (وو، ی، د، ا، ت) کۆتاییان دێت ((هەموو چاوگێ لە زمانی کوردییا بە (ن) کۆتایی دێت... بە لابردنی ئەم (ن)ە ڕەگی ڕابردووی فەرمان دەست دەکەوێ))[1].

---

[1] - وریا عومەر ئەمین، کات و ڕەگی فەرمان، گ. ڕۆژی کوردستان، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد، بەغدا، ژ(٦٥)، ١٩٨٤، ل ٧٨.

| **چاوگ** | **ڕەگی ڕابوردوو(قەدی چاوگ)** |
|---|---|
| چوون | چوو |
| کڕین | کڕی |
| بردن | برد |
| سووتان | سووتا |
| کەوتن | کەوت |

**٢- ڕەگی ڕانەبوردوو:**

ئەو بەشەیە، کە لە چاوگ وەردەگیرێت، لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا بە لابردنی مۆرفیمەکانی ڕەگی ڕابوردوو، ڕەگی ڕانەبوردوو سازدەکرێ، کەواتە بە لابردنی مۆرفیمەکانی ڕابوردوو و بوونی هەندێ حاڵەتی فۆنۆلۆجی، ڕەگی ڕانەبوردوو ساز دەکرێ، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم: چاوگی(ئەلفی)**

ئەگەر چاوگەکە تێپەڕبوو، ئەوا (ن)ی چاوگ و مۆرفیمی (ا)ی ڕابوردوو لادەبەین، ڕەگی ڕانەبوردوو سازدەکرێت، وەکو:

| **چاوگ** | **ڕەگی ڕانەبردوو** |
|---|---|
| کێڵان | کێڵ |
| هێنان | هێن |
| شێلان | شێل |

بەلام ئەگەر چاوگەکە تێنەپەڕبوو، ئەوا بە لابردنی (ن)ی چاوگ و گۆڕینی مۆرفیمی (ا) بۆ (ێ) دروست دەکرێ، وەکو:

| **چاوگ** | **ڕەگی ڕانەبردوو** |
| --- | --- |
| شکان | شکێ |
| برژان | برژێ |
| خنکان | خنکێ |

**دووەم: چاوگی( یائی)**

دروستکردنی ڕەگی کاری ڕانەبوردوو لە چاوگی یائی تێپەڕ و تێنەپەڕ بەهۆی لابردنی (ن)ی چاوگ و (ی) ڕابوردوو دەبێت، وەکو:

| **چاوگ** | **ڕەگی کار** |
| --- | --- |
| کڕین | کڕ |
| فڕین | فڕ |
| بڕین | بڕ |
| لەرزین | لەرز |

**سێیەم: چاوگی (واوی)**

ئەگەر چاوگەکە تێنەپەڕ بوو، ئەوە بە لابردنی (ن)ی چاوگ و مۆرفیمی (وو)، ڕەگی کاری ڕانەبوردوو دروست دەکرێت، وەکو:

| **چاوگ** | **ڕەگی ڕانەبوردوو** |
| --- | --- |
| چوون | چ |
| بوون | ب |

بەڵام ئەگەر چاوگەکە تێپەڕبوو، ئەود تەنیا (ن)ی چاوگ لادەدەین و ڕەگی کار سازدەکرێت، لێرەشدا ڕەگی ڕانەبوردوو و ڕەگی ڕابوردوو (قەدی چاوگ) وەك یەك

دەبێت، بۆ نموونە:

| **چاوگ** | **ڕەگی ڕانەبوردوو** | **ڕەگی ڕابوردوو(قەدی چاوگ)** |
| --- | --- | --- |
| دروون | دروو | دروو |
| گروون | گروو | گروو |

**چوارەم: چاوگی (تائی)**

دروستکردنی ڕەگی کاری ڕانەبوردوو لە چاوگی (تائی)، بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

١ـ بەشێك لە چاوگی (تائی) بەهۆی لابردنی (ن)ی چاوگ و (ت)ی ڕابوردوو، ڕەگی کار دروست دەبێ، وەکو:

| **چاوگ** | **ڕەگی کاری ڕانەبوردوو** |
| --- | --- |
| فرۆشتن | فرۆش |
| گرتن | گر |

٢ـ بەشێك لە چاوگی (تائی) بەهۆی لابردنی (ن)ی چاوگ، ڕەگی کاریان لێدروست دەبێ، واتە هەروەکو (ڕەگی ڕابوردوو، قەدی چاوگی)ی لێ دێت، وەکو:

| چاوگ | **ڕەگی کار** |
| --- | --- |
| بیستن | بیست |
| بەستن | بەست |
| پەرستن | پەرست |

٣ـ هەندێ چاوگی (تائی)، بەتایبەتی ئەو چاوگانەی کە پێش نیشانەی چاوگی (تـن)، پیتی نـەبزوێن دێـت، و لـە پـێش ئـەم پیتـە نەبزوێنـەش، بزوێنـی (ا، ە) دێـت، لـەم حاڵەتەشدا بەهۆی لابردنی (تن) و گۆڕینی پیتی بزوێنی (ا، ە) بۆ (ێ)، ڕەگی کاریان لێدروست دەبێت، واتە لێرەدا دیاردەی فۆنۆلۆجی ڕوودەدات، وەکو:

| چاوگ | ڕەگی کاری ڕانەبوردوو |
| --- | --- |
| پالاوتن | پالێو |
| ڤەشارتن | ڤەشێر |

٤- هەندێك چاوگی (تائی)، بەتایبەتی ئەو چاوگانەی کە پیتی پێش نیشانەی چاوگ بریتین لە (س،ش)، لەم حاڵەتەشدا بە هۆی لابردنـی (تـن) و گـۆڕینی پیتـی (س) بـۆ پیتی(ز)، و پیتی(ش) بۆ پیتی (ژ)، ئینجا ڕەگی کاری ڕانـەبوردوو دروسـت دەبێـت، واتە لێرەدا دیاردەی فۆنۆلۆجی ڕوودەدات؛ وەکو:

| چاوگ | ڕەگی کاری ڕانەبوردوو |
| --- | --- |
| خواستن | خواز |
| گەستن | گەز |
| کوشتن | کوژ |
| پاراستن | پارێز[1] |
| چێشتن | چێژ |
| ڕێشتن | ڕێژ |

[1] لـەم نموونەیـەدا پیتـی(ا)یش بـۆ پیتـی (ێ) گـۆڕدراوە، ئینجـا گۆڕانکارییـەکانی تـر ڕوویانداوە.

٥- هەندێك چاوگی(تائی) هەن، کە لە سەر دەستوور نارِۆن؛ چونکە گۆڕانکارییەکانیان لەگەڵ دەستوورەکانی دروستکردنی (ڕەگی کار) زۆر جیاوازترن، هەروەها گۆڕانکارییەکان لە نموونەیەکەوە بۆ نموونەیەکی تر زۆر جیاوازن، هەر بۆیە ئەم نموونانەی خوارەوە بە بێ دەستوور دەمێننەوە و بە ناوازە لەقەڵەم دەدرێن، وەکو:

| چاوگ | ڕەگی کاری ڕانەبوردوو |
| --- | --- |
| ڕۆیشتن | ڕۆ |
| شوشتن | شۆ |
| گوتن | لێ / بێژ |
| نووستن | نوو |

**پێنجەم : چاوگی(دالی)**

دروستکردنی ڕەگی کاری ڕانەبوردوو لە چاوگی (دالی)، بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

١ـ بەشێك لە چاوگی (دالی) بەهۆی لابردنی (ن)ی چاوگ و (د)ی ڕابوردوو، ڕەگی کار دروست دەبێت، وەکو:

| چاوگ | ڕەگی کاری ڕانەبوردوو |
| --- | --- |
| خوێندن | خوێن |
| مردن | مر |

٢ـ هەندێ چاوگی (دالی)، بەتایبەتی ئەو چاوگانەی کە پێش نیشانەی چاوگی (دن)، پیتی نەبزوێن دێت، و لە پێش ئەم پیتە نەبزوێنەش، بزوێنی (ا، ە) دێت، لەم

حاڵەتەشدا بە هۆی لابردنی (دن) و گۆڕینی پیتی بزوێنی (ا، ە) بۆ (ێ)، ڕەگی کاریان لێدروست دەبێت، واتە لێرەدا دیاردەی فۆنۆلۆجی ڕوودەدات، وەکو:

| **چاوگ** | **ڕەگی کاری ڕانەبوردوو** |
|---|---|
| سپاردن | سپێر |
| چاندن | چێن |
| ناردن | نێر |
| سەندن | سێن |
| برژاندن | برژێن |

٤- - هەندێك چاوگی(دالی) هەن، کە لە سەر دەستوور نارۆن، چونکە گۆڕانکارییەکانیان لەگەڵ دەستوورەکانی دروستکردنی (ڕەگی کار) زۆر جیاوازترن، هەروەها گۆڕانکارییەکان لە نموونەیەکەوە بۆ نموونەیەکی تر زۆر جیاوازن، هەر بۆیە ئەم نموونانەی خوارەوە بە بێ دەستوور دەمێننەوە و بە ناوازە لەقەڵەم دەدرێن، وەکو:

| **چاوگ** | **ڕەگی کاری ڕانەبوردوو** |
|---|---|
| خواردن | خۆ |
| بردن | بە |
| کردن | کە |

# کار

**١. کار لە ڕووی کاتەوە:**

- ڕابوردوو
- ڕانەبوردوو

**٢. کار لە ڕووی هێزەوە:**

- تێپەڕ : بنجی
  نابنجی
- تێنەپەڕ : خوازەکی
  ڕوودان

**٣. کار لە ڕووی پێکهاتنەوە:**

- سادە
- داڕژاو
- لێکدراو

**٤. کار لە ڕووی تەواوییەوە**

- کاری تەواو : ڕابوردوو، ڕانەبوردوو
- کاری ناتەواو: ڕابوردوو، ئێستا، داهاتوو

**٥. کار لە ڕووی ڕێژەوە:**

- ڕاگەیاندن
- دانانی
- فەرمانداں

**٦ـ کار لە ڕووی ئەرێنییەوە:** ئەرێ، نەرێ

## چەمك و پێناسەی کار

کار بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە ڕوودان و کاتی تێدایە، مەبەست لە ڕوودانەکە، ئەوەیە کە شتێك ڕوویدابێ یان ئەنجام درابێ، مەبەستیش لە کات، ئەوا کاتی ڕانەبوردوو و ڕابوردوو دەگرێتەوە[١].

## پۆلێنکردنەکانی کار

**١- کار لە ڕووی کاتەوە:**

کار لە ڕووی کاتەوە بەسەر ڕابوردوو و ڕانەبوردوو دابەش دەکرێت:

**أ ـ کاری ڕابوردوو:** ئەو کارەیە، کە ڕوودانەکەی دەکەوێتە پێش ئاخاوتنەوە، واتا ڕوودانی کارەکە بەسەر چووە و ڕوویداوە ((کرداری ڕابوردوو ئەو کردارەیە، کە پرۆتسێسی ڕوودانەکەی پێش ئاخاوتن بکەوێ))[٢]. لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کاری ڕابوردوو، پەنادەبرێتە بەر چاوگ، ئەمیش بەلابردنی (ن)ی چاوگ ساز دەبێت (( لە زمانی کوردیدا فرمانی ڕابوردوو بە لابردنی (ن)ی چاوگ دروست دەکرێت))[٣]، لەم حاڵەتەشدا کاری ڕابوردووی نزیك دروست دەبێت، کە بە یەکێك لەم پێنج مۆرفێمانە( وو، ی، د، ا، ت) کۆتاییان دێت:

---

(١) بۆ شارەزا بوون لەم بابەتە، بگەڕێوە بۆ: ئەوڕەحمانی حاجی مارف(د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی پێنجەم (کردار)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

(٢) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل٢٠٠ .

(٣) عبدالله شالی، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی( دار الجاحظ)، ١٩٧٦، بەغدا، ل٤.

مۆرفیێمی (وو) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| چوون | - ن | چوو | وو |
| بوون | - ن | بوو | وو |
| دروون | - ن | دڕوو | وو |
| چوون | - ن | چوو | وو |

مۆرفیێمی (ی) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| کڕین | - ن | کڕی | ی |
| فڕین | - ن | فڕی | ی |
| بڕین | - ن | بڕی | ی |
| سڕین | - ن | سڕی | ی |

مۆرفیێمی (د) : -

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| مردن | _ ن | مرد | د |
| کردن | _ ن | کرد | د |
| بردن | _ ن | برد | د |
| خواردن | _ ن | خوارد | د |

مۆرفێمی (ا) :-

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| سووتان | ـ ن | سووتا | ا |
| ڕووخان | ـ ن | ڕووخا | ا |
| شکان | ـ ن | شکا | ا |
| ڕژان | ـ ن | ڕژا | ا |

مۆرفێمی (ت) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| کەوتن | ـ ن | کەوت | ت |
| خەوتن | ـ ن | خەوت | ت |
| شوشتن | ـ ن | شوشت | ت |
| نوستن | ـ ن | نوست | ت |

*** جۆرەکانی کاری ڕابوردوو**

١. ڕابوردووی نزیك:

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێك لە ڕابوردووی نزیکدا دەکات[١].

چاوگ ــ ن = ڕابوردووی نزیك

چوون ــ ن = چوو

بردن ــ ن = برد

(١) نووری عەلی ئەمین: ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٢٠٢.

سووتان — ن — سووتا

کەوتن — ن = کەوت

مردن — ن = مرد

**٢. ڕابوردووی بەردەوام:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودان و بەردەوامی کارێك لەکاتی ڕابوردوودا دەکات[١].

دە + ڕابوردووی نزیك = ڕابوردووی بەردەوام

دە + چوو = دەچوو

دە + برد = دەبرد

دە + کەوت = دەکەوت

دە + خەوت = دەخەوت

**٣. ڕابوردووی دوور:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێك لە ڕابوردووی دووردا دەکات[٢].

ڕابوردووی نزیك + بوو = ڕابوردووی دوور

کەوت + بوو = کەوتبوو

خەوت + بوو = خەوتبوو

سووتا + بوو = سووتابوو

شکا + بوو = شکابوو

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٣.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل ١١٦.

**٤ـ ڕابوردووی تەواو:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێك لە ڕابوردوویەکی نەزۆر دوور و نەزۆر نزیکدا دەکات[1].

ڕابوردووی نزیك + ( وە / یە ) = ڕابوردووی تەواو

( ووە / بیە )

کەوت + ووە / بیە = کەوتووە، کەوتییە

سووتا + وە / یە = سووتاوە، سووتایە

ئەگەر کاری ڕابوردووی نزیك، کۆتایی بە مۆرفیمەکانی (ت، د) هاتبێ، ئەوا بۆ کاری ڕابوردووی تەواو، مۆرفیمەکانی (ووە / بیە) وەردەگرێت، بەڵام جۆرەکانی تر مۆرفیمی (وە / یە) وەردەگرن.

بۆ نەرێ کردنی کاری ڕابوردوو، نیشانەی (نە) وەردەگرێ، کە دەخرێتە سەر بەشی پێشەوەی کارەکە.

| ئەرێ | نەرێ |
|---|---|
| کەوت | نەکەوت |
| برد | نەبرد |
| شکابوو | نەشکابوو |

[1] - نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی لە (صرف و نحو)دا: بەرگی یەکەم، ١٩٥٦، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ل ١٧.

**ب ـ کاری ڕانەبوردوو:**

ئەو کارەیە، کە ڕوودانەکەی دەکەوێتە دوای ئاخاوتن، واتا کارەکە ڕووی نەداوە، یان ئێستا ڕوودەدات یان لە داهاتوودا . لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کاری ڕانەبوردوو، پەنا دەبرێتە بەر (ڕەگی ڕانەبوردوو) و، مۆرفیمی ئەرێی ڕانەبوردووش دەکەوێتە پێش ڕەگەکە و جێناوی لکاویش بە کارەکەوە دەنووسێت، واتا یاساکەی بەم شێوەیە :

مۆرفێمی ئەرێ (دە) + ڕەگی ڕانەبوردوو + جێناوی لکاوی بێ هێز [(١)]

خواردن ⟵ دە + خۆ + م =دەخۆم

شوشتن ⟵ دە + شۆ + ات = دەشوات

شکان ⟵ دە +شکێ + م =دەشکێم

یاسای بنەڕەتی کاری ڕانەبوردوو لە سێ مۆرفیمی ڕەگی کار و کاتی ڕانەبوردوو و جێناوی لکاو پێك دێت و بە گۆڕینی هەر یەکێکیان فۆرم و واتاکەی دەگۆڕێت، و کارەکە تێپەڕ بێت یان تێنەپەڕ، هەمیشە جێناوی لکاوی کۆمەڵەی (م ـ ین) وەردەگرێ[(٢)].

بۆ جیاکردنەوەی کاری ڕانەبوردووی (ئێستا و داهاتوو) لە دیالێکتی ناوەڕاستدا، ئەوە بە هۆی ئاوەڵکارە کاتییەکان جودا دەکرێنەوە ((لە کرمانجیی

---

(١) جێناوی بێهێز ئەوانەن، کە لەگەڵ ڕابوردووی تێنەپەڕدا دەردەکەون و بە دوای ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕدا دێن : بڕوانە: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم ( وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)،ل ١٠٦.

٢ - محەمەد عومەر عەول، دابەشبوونی کرداری لێکدراو لەڕووی داڕشتن و ئەرکەوە (لەکرمانجی خواروو)دا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٢٨.

خوارووداا بۆ جیاكردنەوەی كاتی ئێستا و ئاینده هیچ نیشانەیێكی وشەسازی نییە، جیاكردنەوەیان بە ڕێگەی لێكسیكی واتا بە یاریدەی هەندێك وشە بە تایبەتی ئاوەڵكردارەوە مەبەست دەردەبڕن))[1]، بە جۆرێك بۆ كاتی ئێستا (وا، ئەوا، ئێستا) بەكاردێت و، بۆ كاتی داهاتووش (بەیانی، هەفتەی داهاتوو، مانگێكی تر، هەفتەیەكی .....هتد) بەكاردێت، وەكو:







بۆ نەرێ كردنی كاری ڕانەبوردووش، ئەوا مۆرفێمی (نا) دەچێتە شوێنی (دە) و دەیكات بە نەرێ، وەك :

دەڕۆم ← نارۆم .

**بەیانی دەچم بۆ بازاڕ .**

**بەیانی ناچم بۆ بازاڕ .**

---

(١) د. نەورەحمانی حاجی مارف، كردار، ل ١٩٧.

### ٢. کار لە ڕووی هێزەوە:

کار لە ڕووی هێزەوە دەکرێتە دووبەش:

### أـ کاری تێپەڕ:

لە زمانی کوردیدا زمانەوانان و نووسەران چەندین پێناسەیان بۆ کاری تێپەڕ کردوو[1]، دەتوانین هەموو پێناسەکانیش لە چواردەوری یەك چەمکدا کۆ بکەینەوە، بەو واتایەی بڵێین کاری تێپەڕ ئەو کارەیە، کە کاریگەریی هێزەکەی لە بکەرەوە تێدەپەڕێت بۆ سەر کەرەستەیەکی تر، ئەویش بەرکاری ڕاستەوخۆیە، واتە کاری تێپەڕ بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرێت. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە با سەیری ئەم نموونەیە بکەین :

- گۆران سێوەکەی خوارد .




لەم ڕستەیەدا وشەی (گۆران) بکەری ناو ڕستەکەیە و، بە خواردنی شتێك هەستاوە، کە ئەویش (سێو)ە، هێزەکەش لێرەدا کەوتۆتە سەر بەرکاری ڕاستەوخۆ، کارەکەش کە

---

(١) - سەعید صدقی دەڵێت : (( متعدی فعلیکە لە فاعلەکەی جوی ببیتەوە واحتیاجی ببی بە مفعول بە )) بڕوانە: مختصر صرف ونحوی کوردی، ١٩٢٨، ل٤٤ .

- تەوفیق وەهبی دەڵێت :((فیعلی موتەعەددی کاریَ بەیان ئەکا کەلە باسلێکراوەو تەجاوەزی کەسێ یان شتێکیتر بکا)) بڕوانە: دەستووری زمانی کوردی،١٩٢٩، ل ٤٢.

- نوری عەلی ئەمین دەڵێت : ((چاوگی تێپەڕ ئەو چاوگەیە هەر کاتێ فرمانێکی لێ دروست کرا، فرمانەکە لە (مسندالیە)یەکەی جویَ ئەبێتەوە بۆ کەسێ یا شتێکی تر)) بڕوانە : ڕێزمانی کوردی، ١٩٦٠، ل٦١.

- د.نەورەحمانی حاجی مارف دەڵێت: ((واتای چالاکی کاراو ڕێچکەی بەردوبەرکار نیشان دەدات)) بڕوانە: ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی پێنجەم (کردا)، ٢٠٠٠، ل٤٦ .

(خوارد)ە، کارێکی تێپەڕە. دەبێت ئەوەش بوترێت کە لە زمانی کوردیدا هەموو کارێکی تێپەڕ لەناو ڕستەدا، یەك بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرێت، بەڵام بۆ بەرکاری ناڕاستەوخۆ، ئەوا دەشێت لە ڕستەی کاری تێپەڕدا بەرکارێکی ناڕاستەوخۆ یان زیاتر ببینرێت . لەم وێنەیەی خوارەوەدا فراوانترین سنووری کاری تێپەڕ بەپێی کەردستە سەرەکییەکان لەناو ڕستەدا دەخەینە ڕوو: [1]

**ئازاد شەویَ لە ماڵەوە پارە بۆ نەوزاد لە باوکم وەردەگریَ .**

لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار لە ڕستەی کاری تێپەڕدا، وا دەبێت بەرکارەکەی لە ڕووی سیما (ڕوخسار)ەوە بە دیارناکەوێت، کە ئەمەش وای لە زۆر کەس کردووە بە هەڵەدا بچن و بڵێن ئەم ڕستەیە بەرکاری تێدا نییە، بەڵام لە ڕووی واتاوە بەرکارێك لەناو ڕستەکەدا دەبینرێت، وەك ( ئازاد دەتوانیَ بنووسیَ)[2]،لێرەدا لە ڕووی ڕووخسارەوە بەرکار دەرنەکەوتووە، بەڵام لە ڕووی واتاوە بەرکار دەرکەوتووە، چونکە ئازاد دەتوانیَ شتیَ بنووسیَ، جا ئەم شتە نامەیە .. وتارە .. شیعرە.. یا هەر شتێکی تر ...

کاری تێپەڕ لە ڕووی هەبوونەوە، بە سەر دوو جۆر دابەش دەبێت :-

١- تێپەڕی ڕەسەن (بنجی)، ئەو کارە تێپەڕانە دەگرێتەوە،کە لە بناغە و بنجدا تێپەڕن، وەك ( برد، کرد، شوشت، خوارد،....).

---

(١) عومەر مەحموود کەریم، کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی پەروەردە (ئیبن روشد)ی زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٤، ل٤١.

(٢) د. نەورۆحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، کردار، ل ٣١٦ .

٢- تێپەڕی نارەسەن (نابنجی)، ئەو کارە تێپەڕانە دەگرێتەوە، کە لە بناغەدا تێنەپەڕن. بەڵام بەهۆی پاشگری (-اندن) بوونەتە کارێکی تێپەڕ،[١] وەك:

خەوتن ⟵ خەو + اندن = خەواندن .

هەروەها کاری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا، هەروەك زمانی عەرەبی دەشێت یەك بەرکار وەرگرێ و، دەشێت زیاتر بێت، بەم شێوەیەی خوارەوە [٢] :

یەکەم/ ئەو کارە تێپەڕانەی کە یەك بەرکار لەناو ڕستەدا وەردەگرن، وەك :




دووەم/ ئەو کارە تێپەڕانەی کە دوو بەرکار(بەرکارێکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەرکارێکی ناڕاستەوخۆ) لە ڕستەدا وەردەگرن،وەك :




(٢) مصطفی محمد زەنگنە، کار و ئەرکی لە سینتاکسدا، ل٢٤.

(١) عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل ٤١ .

سێیەم/ ئەو کارە تێپەڕانەی، کە سێ بەرکار وەردەگرن، وەك کارەکانی (وەرگرتن، دان، بردن سەندن، کڕین )[1]، وەك :

**من پارە لە تۆ وەردەگرم بۆ ئازاد .**

لە زمانی کوردیدا ڕێگاچارە دانراوە بۆ گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆ کاری تێپەڕ، ئەویش بە زیادکردنی پاشگری (-اندن) و خستنە سەر ڕەگی کارەکە، کە بە هۆیەوە دەیکاتە تێپەڕ، وەك :-

خەوتن ← خەو + اندن = خەواندن

فڕین ← فڕ + اندن = فڕاندن

شکان ← شکا + اندن = شکاندن

ڕووخان ← ڕووخا + اندن = ڕووخاندن

لەم کارانەی سەرەوەدا، کارەکانی (شکا، ڕووخا) بە (ا) کۆتاییان هاتووە، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە لە ڕەگی ڕابوردووەوە وەرگیراون بۆ کردنی بە تێپەڕ، دیارە لە نێوان ئەم دوو (ا)ە، یەکەکیان لەناو دەچێت، چونکە لە زمانی کوردیدا هەرگیز دوو بزوێن بە دوای یەکتردا نایێن.

هەروەها هەندێك کاری تێنەپەڕمان هەیە، کە بەرانبەرەکەیان کاری تێپەڕی هەیە، لەوانە[2]:

---

(٢) نەریمان عەبدوللا خۆشناو، کاری تێپەڕ ـ لێکۆڵینەوەیەکی بەرانبەرییە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گ . کاروان، ژ. (١٩٨)، ٢٠٠٥، ل ١٥٨-١٥٩.

(١) لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل١٢٣.

| تێنەپەڕ | | تێپەڕ |
|---|---|---|
| کەوتن | ← | خستن |
| هاتن | ← | هێنان، هانین |
| چوون | ← | بردن |
| ڕۆیشتن | ← | ناردن |
| ڕژان | ← | ڕشتن |
| گۆڕان | ← | گۆڕین |
| سڕانەوە | ← | سڕینەوە |
| پچڕان | ← | پچڕین |
| بزووتن | ← | بزاوتن |
| سوان | ← | سوین (سوون) |
| قەلشتن | ← | قەڵاشتن |
| قڵیشان | ← | قەڵاشتن |
| مانەوە | ← | هێشتنەوە، هێلانەوە |
| مان | ← | هێشتن، هێلان |
| کشانەوە | ← | کێشانەوە |
| هەڵستان | ← | هەڵگرتن |

هەروەها هەندێك كاری تێنەپەڕمان هەیە، دەشێت بەهۆی (-اندن)ەوە بكرێنە تێپەڕ، سەرەڕای ئەوەش كاری تێپەڕی بەرانبەریان هەیە، وەك :

| **تێنەپەڕ** | | **تێپەڕ** |
| --- | --- | --- |
| **کەوتن** | ← | **کەواندن، خستن** |
| **مردن** | ← | **مراندن، کوشتن** |
| **چوون** | ← | **چواندن، بردن** |

لێرەدا له زۆر حاڵەتدا مانای تێپەڕی بەرانبەر و بە تێپەڕکراوەکە وەك یەك نابن، وەك (مردن) تێپەڕی بەرانبەری (کوشتن)ە و، دەکرێت بە (مراندن)، بەڵام لە ڕووی واتاوە (مراندن) و (کوشتن) جوودان [1]، وەك :

- **پیاوەکە خۆی کوشت – لێرە مردووە .**
- **پیاوەکە خۆی مراند - لێرە نەمردووە**

هەروەها هەندێك کاری تێنەپەڕمان هەیە، کە بەرانبەریان کاری تێپەڕی نییە و پاشگری( ـ اندن)یش وەرناگرن، وەك[2]:

**( سرەوتن، نیشتن، زان، گەنین )**

دیارە لێرەدا ئەم وشانە ڕوودانیان لە ژوور ئارەزوو و دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە، چونکە ((تۆ دەتوانی یەکێکی تر( بخەوێنی و یا بشێوێنی) بەهۆی ئەو ئامرازانەوە، کە خەوتن و شێوان پەیدا دەکەن، بەڵام ناتوانی لە دەروونی هەمان کەسدا (سرەوتن) پەیداکەیت، چونکە سرەوتنەکە لەلاوە نایەت بۆی ....)) [3]

هەروەها هەندێك کاری تێنەپەڕ، بە یارمەتی کاری یارمەتیدەری (هێنان) و (خستن)ەوە دەکرێنە تێپەڕ، وەك:

---

(١) پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل١٨٨.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٥٨.

(٣) لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل١٢٣.

**منداڵەکەی هێنایە پێکەنین .**

**منداڵەکەی خستە گریان .** (١)

ئەگەرچی لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد، کە پاشگری (-اندن) کاری تێنەپەڕ دەکاتە تێپەڕ، هەروەها دەوری ڕۆنانی کاری تێنەپەڕیش دەبینێت، بەتایبەتی کاتێك کە دەچێتە سەر ناوی دەنگە سروشتییەکان و دەیانکات بە کاری تێنەپەڕ، وەك :

**قیژە + اندن = قیژاندن**

**گرمە + اندن = گرماندن**

**باعە + اندن = باعاندن**

**زیڕە + اندن = زیڕاندن**

**باڕە + اندن = باڕاندن** (٢)

هەروەها (-اندن) چەندین ئەرکی تری جودا جودا دەبینێت، لەوانە چاوگی لێکدراو دەکات بە چاوگی داڕژاو، وەك :

نەخش کردن ← نەخشاندن (٣)

هەروەها کار و چاوگی بێگانەی تێپەڕ، بەتایبەتی لە زمانی عەرەبی دەکاتە کوردی و هەر بە تێپەڕیش دەمێنێتەوە و، هەموو تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردی وەردەگرێت، وەك:

«شبه» + اندن = شوبهاندن

---

(٤) عومەر مەحمود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل ٥٩.

(١) لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل١٢٣.

(٢) د.نەسرین فەخری، پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا،١٩٧٤، ل ٢٢٧ .

خلق + اندن = خولقاندن [1]

دیارە ئەم حاڵەتانەی، کە لەودوپێش ئاماژەمان بۆی کرد، هەموو وەك خۆی سەداسەد بەبێ گۆڕانکاری بەکارنایێت، بەڵکو حاڵەتی تریش هەن و هەندێك گۆڕانکاریش دەبینیرێت لە کاتی خستنە سەری پاشگری(-اندن) بۆ سەر کارەکان و، ئەرکی (-اندن) گەلێك زۆرە، بەلاّم لێرەدا هەر ئەوەندە ئاماژەی بۆ دەکەین، لەگەڵ ئەمانەشدا دەبێت ڕێکخستن و شێوازی پاشگری(-اندن) ڕوون بکەینەوە، کە چۆن سازبووە، چونکە وەك زانراوە، کە پاشگری(-اندن) هەر هەمووی مۆرفێمی تێپەڕاندنی کار نییە، بەڵکو بە تەنیا (ن)ی یەکەم مۆرفێمی تێپەڕاندنە، کەواتە دەبێت (ن)ەکە، مۆرفێمی تێپەڕاندن بێت، چونکە (ا) نیشانەی کاتە بۆ ڕابوردوو و،(ێ)ش نیشانەی کاتە بۆ ڕانەبوردوو[2].

## ب- کاری تێنەپەڕ:

لە زمانی کوردیدا نووسەران و زمانەوانانمان چەندین پێناسەیان بۆ کاری تێنەپەڕ کردووە[3]، دەتوانین هەموو پێناسەکان لە چواردەوری یەك چەمكدا کۆبکەینەوە، بەو

(٣) هەمان سەرچاوە، ل٢٢٣.

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧.

(٢)- سەعید صدقی دەڵێت: ((لازم فعلیکە دەبی لازم فاعلەکەی لێی جوێ نەبیتەوە و محتاج بە مفعول بە نەبی وکو حسن هات )) بڕوانە: مختصر صرف ونحوی کوردی، ١٩٢٨، ل ٤٤ .

- تەوفیق وەهبی دەڵێت: (( فیعلی لازیم کارێ یان حاڵێ بەیان نەکا کە لە باسلێکراوەوە ڕاستەوخۆ تەجاوزی کەسێ یان شتێکیتر نەکا، وەکو تەل ئەفرێ )) بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی، ١٩٢٩، ل ٤٢ .

- نوری عەلی ئەمین دەڵێت: (( چاوگی تێنەپەڕ ئەو چاوگەیە هەر کاتێ فرمانێکی لێ دروست کرا لە (مسندالیە)یەکەی جوێ نەبیتەوە بۆ کەسێ یان شتێکی تر، وەکو دۆیەکە ڕژا )) بڕوانە : ڕێزمانی کوردی، ١٩٦٠،ل٦٠.

واتایەی بڵێین کاری تێنەپەڕ ئەو کارەیە، کە کاریگەری هێزەکەی لە بکەرەوە تێناپەڕێت بۆ سەر بەشێکی تر، بەو واتایەی ناچێتە سەر بەرکاری ڕاستەوخۆ، واتا خاڵی جیاکردنەوەی تێنەپەڕ لە تێپەڕ، بەرکاری ڕاستەوخۆیە، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، با سەیری ئەم نموونەیە بکەین :

- **ڕزگار** **ڕۆیشت** .



بکەر     کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ

لەم ڕستەیەدا وشەی (ڕزگار) بکەری ناو ڕستەکەیە و، کارێکی ئەنجامداوە، ئەویش (ڕۆیشتن)ە، هێزەکەی لەناو ڕستەدا تەنیا لە دەوری بکەر جێگیر بووە و نەچۆتە سەر کەرەستەیەکی تر و، کاری (ڕۆیشت)یش کارێکی ڕابوردووی تێنەپەڕە، ئەم ڕستەیەی سەرەوەش بە تەسکترین ڕستەی کاری تێنەپەڕ دەژمێردرێت، کە تەنیا (بکەر)ی لەناو ڕستەدا وەرگرتووە، بەڵام دەشێت لە شوێنی تردا کاری تێنەپەڕ، جگە لە(بکەر) لەگەڵ چەندین کەرەستەی تردا دەرکەوێت، لەوانە (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)، هەروەکو لەم وێنەیەی خوارەوەدا فراوانترین سنووری کاری تێنەپەڕ لەناو ڕستەدا دەخەینە ڕوو[(١)] :-

**منداڵەکە دوێنێ لەماڵەوە زۆر لە پیاوەکە ترسا .**

لە زمانی کوردیدا کاری تێنەپەڕ لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە[(٢)]:

١- **تێنەپەڕی خوازەکی:** لەم جۆرە کارانەدا دەوری (بکەر) شتێکی ئاشکرا و ئیرادییە، وەك :-

---

- د. نەورەحمانی حاجی مارف دەڵێت: (( کرداری تێنەپەڕ پێوەندیی ڕوودان بە کاراوە رادەگەیەنن، و ئەم جۆرە کردارانە پێویستیان بە بەرکار نی یە)) بڕوانە: ڕێزمانی کوردی، کردار، ٢٠٠٠، ل ٤٦ .

(١) عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل٤٣ .

(٢) د.نەورەحمانی حاجی مارف، کردار ، ل ٥٠ .

**ئازاد هات .**

**کوڕەکە ڕۆیشت.**

لێرەدا کارە تێنەپەڕەکانی (هات، ڕۆیشت )،پێویستییان بە بکەری ڕاستەقینەی ناو ڕستەکە هەیە بۆ هەڵسوڕانی کارەکە ...

٢- **تێنەپەڕی ڕوودان :** لەم جۆرەدا، بکەر دەورێکی تایبەتی خۆی نییە، بەو واتایەی کە ئیشەکە بەبێ ویستی بکەر دێتە دی، وەك :-

**ئاوەکە ڕژا .**

**شوشەکە شکا .**

لەم ڕستانەدا کارە تێنەپەڕەکانی (ڕژا، شکا) پێویستییان بە دەرکەوتنی بکەرەکە نییە، هەروەها ڕۆڵی بکەر بەدەرناکەوێت.

دەبێت لێردا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە لە زمانی کوردیدا ناشێت کارێکی تێپەڕ بۆ کاری تێنەپەڕ بگۆڕدرێت، واتە کارە تێنەپەڕەکان تەنیا ئەو کارانە دەگەڕێتەوە، کە لە بنجدا تێنەپەڕن .

### ٣. کار لە ڕووی پێکهاتنەوە

سەبارەت بە پۆلێنکردنی کار لە ڕووی پێکهاتنەوە، ئەوە زمانەوانان و نووسەران بیروبۆچوونی جیاجیایان خستۆتە ڕوو، هەندێکیان لەو باوەڕدان کە (کاری سادە) نەك هەر لە زمانی کوردی، بەڵکو لە هیچ زمانێکی جیهاندا نییە، لەم بارەوە (د.محەمەد مەعروف فەتاح) دەڵێت ((کاری سادە لە زمانی کوردیدا نییە)).[1] هەروەها (د.وریا عومەر ئەمین)یش هەمان بۆچوون و ڕای هەیە کە دەڵێت ((بەپێی پێوەرە تازەکانی زمانەوانی و

---

١ - محەمەد مەعروف فەتاح (د)، کارو پۆلێن کردنەکانی بەپێی ڕژنان، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، ١٩٨٩، ل ٤٠ - ٤٩.

مەنتیقی پەیوەندی نێوان کەرەسەکانی زمان، کاری سادە نەك هەر لە کوردیدا نییە: بەڵکو لە هیچ زمانێکا نابێ هەبێ))[١]. دیارە هەردوو زمانەوانەکە لەسەر بنەمای مۆرفیم سەیری کاریان کردووە، هەر بۆیەشە ئەم بیروبۆچوونەیان هەیە. لەهەمان کاتیشدا (د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف) ئەمە بە ڕاست نازانێت کە کاری سادە لە زمانی کوردیدا نەبێت، هەر بۆیە لە وتارێکی ڕەخنەییدا بەپێی بۆچوونەکانی خۆی و بەنموونەی پراکتیکی ڕاستی بوونی کاری سادە لە زمانی کوردیدا دەردەخات[٢].

بۆیە ئێمە وەکو لە دەستپێکی کتێبەکەدا ئاماژەمان بۆ کرد، کە لەسەر بنەمای وشەوە سەیری کار دەکەین، هەر بۆیە کار لە ڕووی پێکهاتنەوە بە لای ئێمەوە بەسەر (کاری سادە، کاری دارِژاو، کاری لێکدراو) دابەش دەکرێت.

١. **کاری سادە:** بەو کارانە دەوترێت کە لە یەك وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکدێت، وەکو : برد، ڕۆیشت، شکا ........هتد.

٢. **کاری دارِژاو:** کارێکی ناسادەیە: لەکارێکی سادەی واتادار و پاشگرێك یان پێشگرێکی بێ واتا پێکدێت، یاخود لەگەڵ هەردووکیان پێکدێت، بەم شێوەیە:

**أ- پێشگر + کاری سادە = کاری دارِژاو**

هەڵ + واسی = هەڵواسی

هەڵ + بڕی = هەڵبڕی

ڕا + کرد = ڕاکرد

ڕا+ گرت = ڕاگرت

---

٢ - وریا عومەر ئەمین (د)، ڕەخنەی نارەخنە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٠)، ١٩٩٧، ل ٢٢ ـ ٢٤.

٣ - ئەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، وتاری کار بەپێی ڕۆنان و چەند سەرنجێك، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٩)، ١٩٩٧، ل ٨ ـ ١٩.

دا + خست = داخست

دا + گرت = داگرت

ڕۆ + چوو= ڕۆچوو

**ب ـ پێشگر + کاری سادە + پاشگر = کاری داڕژاو**

هەڵ + کر + ەوە = هەڵکردەوە

هەڵ + دا + وە = هەڵداوە

دا + خست + ەوە = داخستەوە

**جـ ـ کاری سادە + پاشگری (ەوە) = کاری داڕژاو**

خوارد + ەوە = خواردەوە

چوو + دوە = چووەوە

هات + ەوە = هاتەوە

**د ـ کاری سادە + پاشگر (اندن) = کاری داڕژاو**

ڕژا + اندن = ڕژاندن

سووتا + اندن = سووتاندن

**هـ-ڕەگی کار + اندن = کاری داڕژاو**

مر + اندن = مراندن

کەو + اندن = کەواندن

تێبینی: هەندێك جار پاشگر کە دەچێتە سەر کاری سادە، واتای کارەکە تەواو دەبێت، چونکە کاری سادەی نەوتۆمان هەیە، کە بە سادەیی واتایان نییە، تاکو نەکرێنە کاری داڕژاو، وەکو:

حەسا + ی + ەوە = حەسایەوە

دۆزی + ی + دوە = دۆزییەوە

کولاّ + ی + ەوە = کولاّیەوە

لەرا + ی + ەوە = لەرایەوە

**٣ـ کاری لێکدراو:** ئەو کارەیە کە لە دوو وشەی سادە یان زیاتر پێکدێت و، لەناو ڕستەشدا وەکو وشەیەکی سەربەخۆ ئەرکی خۆیان دەبینن، ئەم وشە لێکدراوانەش لە کارێك لەگەڵ بەشێکی تری ئاخاوتن پێك دێن، وەکو:

**١ـ ناوی سادە + کاری سادە = کاری لێکدراو**

دەست + کەوت = دەستکەوت

شەڕ + کرد = شەڕکرد

یارمەتی + دا = یارمەتیدا

سوار + بوو= سواربوو

**٢ـ ناوی داڕژاو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ڕێگا + گرت = ڕێگاگرت

گەرما + بوو = گەرمابوو

**٣ـ ناوی لێکدراو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

چلکاو + خواردن = چلکاوخواردن

ماستاو + خواردن = ماستاوخواردن

ماڵئاوایی + کرد = ماڵئاواییکرد

**٤ـ ناوی سادە + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

دەست + هەڵبڕی = دەست هەڵبڕی

چاو + پێ کەوت = چاوپێکەوت

**٥- دووبارەکردنەوەی ناو+ کاری سادە+= کاری لێکدراو**

کون کون + کرد=کون کون کرد

کون کون + بوو=کون کون بوو

**٦- ناوی داڕژاو + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

جێگە + کردەوە = جێگەکردەوە

**٧ـ فرێزی ناوی + کاری سادە = کاری لێکدراو**

لەهۆش + چوو = لەهۆش چوو

لەبیر + کرد = لەبیرکرد

**٨ـ فرێزی ناوی + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

بەبیر + هاتەوە = بەبیر هاتەوە

**٩ـ ئاوەڵناوی سادە + کاری سادە = کاری لێکدراو**

بڵند + کرد = بڵندکرد

خۆش + کرد = خۆشکرد

**١٠- دووبارەکردنەوەی ئاوەڵناو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ورد ورد + کرد = وردوردکرد

ورد ورد + بوو = ورد ورد بوو

**١١- ڕەگی کار + کاری سادە = کاری لێکدراو**

پرس + کردن = پرسکردن

خەو + هاتن = خەوهاتن

**١٢ـ ئاوەڵناوی داڕژاو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

بەهێز + کرد = بەهێزکرد

نەخۆش + کەوت = نەخۆشکەوت

**١٣ـ ئاوەڵناوی لێکدراو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

دڵخۆش + کرد = دڵخۆشکرد

دڵشاد + بوو = دڵشادبوو

**١٤ـ ئاوەڵناوی سادە + کاری داڕێژاو = کاری لێکدراو**

نوێ + کردەوە = نوێکردەوە

تیژ + کردەوە = تیژکردەوە

**١٥ـ ئاوەڵناوی داڕێژاو + کاری داڕێژاو = کاری لێکدراو**

بەئاگا + هاتەوە = بەئاگاهاتەوە

بەهێز + بووەوە = بەهێزبووەوە

**١٦ـ ئاوەڵناوی لێکدراو + کاری داڕێژاو = کاری لێکدراو**

دڵسارد + کردەوە = دڵساردکردەوە

دڵخۆش + کردەوە = دڵخۆشکردەوە

**١٧ـ ئاوەلکاری سادە + کاری سادە = کاری لێکدراو**

زۆر + کرد = زۆر کرد

کەم + کرد = کەمکرد

کەم + بوو = کەمبوو

**١٨ـ ئاوەلکاری سادە + کاری داڕێژاو = کاری لێکدراو**

کەم + کردەوە = کەمکردەوە

زۆر + کردەوە = زۆر کردەوە

**١٩ـ ئاوەلکاری داڕێژاو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

لەناو + چوو = لەناچوو

لەناو + برد = لەناوبرد

**٢٠ـ وشەیەك مانای سەربەخۆی نەبێت + کاری سادە = کاری لێکدراو**

واز + هێنا = وازهێنا

نقووم + بوو = نقوومبوو

فڕێ + دا = فڕێدا[1]

**٢١- ئامرازی سەرسوڕمان + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ئاخ + خواردن = ئاخخواردن

داخ + خواردن = داخخواردن

**٢٢- ئامرازی سەرسوڕمان + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

ئاخ + هەڵکێشان = ئاخ هەڵکێشان

### ٤- کار لە ڕووی تەواوییەوە

کار لە ڕووی تەواوییەوە بەسەر کاری تەواو و کاری ناتەواو دابەش دەکرێت، کە دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە بەراوردیان بکەین :

| کاری تەواو | کاری ناتەواو |
| --- | --- |
| ١- کات و ڕوودانی تێدایە . | ١- تەنیا کاتی تێدایە. |
| ٢- کارە تەواوەکان لە زمانی کوردی بریتین لە ڕابوردوو، ڕانەبوردوو و فەرمانداون | ٢- کارە ناتەواوەکان ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو دەگرنەخۆ. |
| ٣- کارە تەواوەکان ژمارەیان زۆرە. | ٣- کارە ناتەوەکان ژمارەیان دیاریکراوە، چونکە لە چاوگی (بوون) وەرگیراون،بەم شێوەیە: |
| ٤- ئەگەر کاری تەواو لە ڕستەدا هەبێت، ئەوا چەمکی بکەر و بەرکاری | بوو: بۆ کاتی ڕابوردوو |

١ - بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: ١- نەورەحمانی حاجی مارف (د)، کردار. ٢- لیژنەیەک لەوەزارەتی پەروەردە، کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی سێیەم، چاپی ٢٠٠٧.

ڕاستەوخۆ یاخود تەنیا بکەر لە ڕستەکەدا بوونی دەبێت.

٥ـ لە ڕووی هێزەوە تێپەڕ و تێنەپەڕن.

ه : بۆ کاتی ئێستا

ب : بۆ داهاتوو

دەبم - دەبین

دەبیت — دەبن

دەبێت - دەبن

٤ـ ئەگەر کاری ناتەواو لە ڕستەدا هەبێت، ئەوا چەمکی نیهاد و گوزارە لە ڕستەکەدا بوونی دەبێت.

٥ـ لە ڕووی هێزەوە تەنیا تێنەپەڕن.

## کاری ناتەواو لە زمانی کوردیدا

بەو کارانە دەوترێت کە بە تەنیا بەکارنایەن، بەڵکو دەچنە پاڵ وشەیەکی تر، کە پێیان دەوترێت تەواوکەری کاری ناتەواو، ئینجا واتا دەبەخشن.
وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد کە کارە ناتەواوەکان لە زمانی کوردیدا لە چاوگی (بوون)ەوە وەرگیراون، بۆ ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو بەکاردێن.

بوون

بوو.................. ڕابوردوو

ه...................... ئێستا

ب .................. داهاتوو

دەبم - دەبین

دەبیت — دەبن

دەبێت - دەبن

شێرزاد زیرەکـــــە.
نیهاد گوزارە کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا
ئــازاد مــامۆستــا بــــــوو.
نیهاد گوزارە کاری ناتەواو بۆ کاتی ڕابوردوو
تریفە دەبــێـت بـــە ئـەنـدازیـار.
نیهاد کاری ناتەواوە بۆ کاتی داهاتوو پێشبەند بەرکاری ناڕاستەوخۆ

کـارە ناتـەواوەکان لـە ڕووی هێـزەوە تێنەپـەڕن، واتـە پێویسـتییان بـە بـەرکاری ڕاستەوخۆ نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لـە دوو حاڵەتـدا کـارە ناتـەواوەکان دەبـن بـە کـاری تەواو، ئەگەر بە واتای لەدایکبوون بێت یاخود بەواتای هەبوون یا خاوەنداریەتی بێـت، لـەم حاڵەتانەشدا کارەکان لەڕووی هێزەوە دەبنـە تێپـەڕ یـان تێنەپـەڕ، هـەروەك ئـەم نموونانـەی خوارەوەدا دەردەکەون:

ژنەکە مـــنـــداڵـێـی بـــوو.
بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری ڕابوردووی تێپەڕ
محەمەد کراسێکی هەیە.
بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ
داردکە شـــین بـــوو
بکەر کاری لێکدراوی تێنەپەڕە

**نیهاد:** ئەو بەشەی ڕستەیە، کە شتێکی خراوەتە پاڵ و هیچ شتێ ئەنجام نادات.
گوزارە: ئەو شتەیە کە دەخرێتە پاڵ نیهادەکە و هەمیشە کارێکی ناتەواوی لەگەڵدایە.

**٥- کار لە ڕووی ڕێژەوە**

١. **ڕێژەی ڕاگەیاندن:** بەو ڕێژەیە دەوترێت کە ڕاستەوخۆ ڕوودانی کارەکە پیشان دەدات و ڕوودانی کارەکەش دەخاتە پاڵ کەسێك یان شتێك. ئەو جۆرانەی کە لە بابەتی کار لە ڕووی کاتەوە ئاماژەمان بۆی کرد، ئەوە دەچنە ناو چوارچێوەی ڕێژەی ڕاگەیاندنەوە.

٢. **ڕێژەی دانانی:** ئەو ڕێژەیەی کارە، کە ڕاستەوخۆ ئەنجامی ئەو هەواڵەی کە دەیداتە پاڵ کەسێك یان شتێك نایدات بەدەستەوە، بەڵکو لە شێوەی (گومان، ئارەزوو، ئاوات،...هتد) مەبەستەکەی دەردەکەوێت، واتە لەم ڕێژەیەدا وشەکانی (خۆزگە، بریا، دەبوایە، دەبوو، دەبێت،...هتد) لە ڕستەکەدا بەکاردەهێنرێن. ڕێژەی دانانیش هەردوو حاڵەتی ڕابوردوو و ڕانەبوردوو دەگرێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە :

**١. کاری ڕابوردووی دانانی:**

أ. ڕابوردووی نزیکی دانانی

ڕابوردوونی نزیکی ڕاگەیاندن + با + جێناوەکان

کرد + با + م = کردبام

کەوت + با + م = کەوتبام

گرت + با + م = گرتبام

ب. ڕابوردووی تەواوی دانانی

ڕابوردووی نزیکی ڕاگەیاندن + ب + جێناوەکان

کەوت + ب + م = کەوتبم

کرد + ب + م = کردبم

گرت + ب + م = گرتبم

ج. ڕابوردووی بەردەوامی دانانی

ب + ڕابوردووی نزیکی ڕاگەیاندن + ایە

ب + کەوت + ایە = بکەوتایە

ب + گرت + ایە = بگرتایە

د. ڕابوردووی دووری دانانی

ڕابوردووی دووری ڕاگەیاندن + ایە

کەوتبوو + ایە = کەوتبووایە

گرتبوو + ایە = گرتبووایە

کردبوو + ایە = کردبووایە

**٢. کاری ڕانەبوردووی دانانی**

نیشانەی (ب) دەچێتە شوێنی (دە)ی ڕانەبوردووی ڕاگەیاندن، واتە (ب + ڕەگی کار + جێناوەکان) .

دەڕوات ............بڕوات

دەچێت ............ بچێت

دەشوات........... بشوات

دەکێلێت ......... بکێلێت

**٣. ڕێژەی فەرماندان**

مەبەست لە فەرماندان ئەوەیە، کە کەسی یەکەم (قسەکەر) داوا لە کەسی دووەم (تاك، کۆ)، واتە(گوێگر) دەکات، بۆ ئەنجامدانی کارێك. دەستووری کاری فەرماندان لە زمانی کوردیدا بەم شێوەیە:

**بۆ ئەرێ**

ب + ڕەگی کار + جێناوی کەسی دووەم (ە، ن)

خوێندن ......... بخوێنە، بخوێنن

شووشتن ........ بشۆ، بشۆن

کردن .......... بکە، بکەن

خواردن ........ بخۆ، بخۆن

هەندێ جار جێناوی (ە)ی کەسی دووەمی تاك دەرناکەوێت، لەبەرئەوەی ڕەگی کارەکە کۆتایی بە بزوێنی (ە، ۆ) دێت.

لە کارەکانی دارِژاو و لێکدراودا،دەشێت مۆرفیمی (ب)ی فەرماندان نەنووسرێت، وەکو:ـ

دانیشتن ........... دابنیشە، دانیشە

سەرکەوتن ........ سەربکەوە، سەرکەوە

هەندێ جار کاری فەرماندان لە دەستوور لادەدات، بۆ نموونە :ـ

کاری (هاتن) ئەگەر لەسەر دەستوور بڕوات، دەبێ بوترێ (بێ، بێن)، بەڵام فەرماندانی ئەو کارە لە دەستوور لادەدات و دەبێت بە (وەرە)، کەچی لە حاڵەتی نەرێدا دەگەڕێتەوە سەر دەستوور (مەیێ، مەیێن) .

لە ئاخاوتنی زمانی کوردیدا هەندێ ڕستە و دەستەواژەمان هەیە بۆ مەبەستی فەرماندان بەکاردێن، بەبێ ئەوەی مۆرفیمی فەرماندانی تێدا بێت، بۆ نموونە :

**جگەرە کێشان قەدەغەیە.**

**وەستانی ئۆتۆمبێل قەدەغەیە.**

### ٦.کار لە ڕووی ئەرێییەوە

**ئەرێ:** کردەیەکی ڕێزمانییە، ئەرکی سەرەکی جێ بەجێ کردنی کاری ڕستەکە دەگرێتەخۆ.

**نەرێ:** کردەیەکی ڕێزمانییە، کە جگە لە ئەرکی سەرەکی کە جێبەجێ نەکردن و بەرپەرچدانەوەی بەشێکی ڕستە یان هەموو ڕستەکەیە، کەچی لە هەندێ زماندا (بۆ نموونە زمانی کوردی) ئەرکی پێچەوانەیی، بەراوردی، یەکسەری، سووربوون، پێداگرتن و دوودڵی بەجێ دەهێنێ. ئەم کردەیە لە زمانی کوردیدا بەدانانی نیشانەکانی نەرێی پێش کارێك یان ناوێك یان ئاوەڵناوێك ئەنجام دەدرێت[1].

## نیشانەکانی نەرێ لە زمانی کوردیدا

### ١. بۆ کاری ڕابوردوو

نیشانەی (نە) بەکاردێ، کە دەکەوێتە بەشی پێشەوەی کارەکە، وەکو:

کرد.............. نەکرد

برد.............. نەبرد

خوارد........... نەخوارد

ڕۆچوو........... ڕۆنەچوو

بەخێوکرد....... بەخێونەکرد

### ٢. بۆ کاری ڕانەبوردوو

أ ـ نیشانەی (نا) بەکاردێت، کە دەچێتە شوێنی (دە)ی ڕانەبوردووی ڕاگەیاندن، وەکو

دەکەم .......... ناکەم

دەڕوات ........ ناڕوات

---

1 - عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول، ناکردن لەکوردیدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩١، ل ٥.

دەخوات ....... ناخوات

دەبات ........ نابات

ب ـ نیشانەی (نە) بەکاردێت، کە دەچێتە شوێنی (بـ)ی ڕانەبوردووی دانانی، وەکو:

بخوات ........ نەخوات

بڕوات ........ نەڕوات

**٣. بۆ کاری فەرماندان**

نیشانەی (مە) بەکاردێت، جگە لەوەش هەندێ جار (نا، نە) بەکاردێ، کە دەچێتە شوێنی مۆرفیمی (ب) فەرماندان، وەکو:

بڕۆ ....... مەڕۆ، نەڕۆی، ناڕۆی

بخۆ ...... مەخۆ، نەخۆی، ناخۆی

بکێڵن ... مەکێڵن، نەکێڵن، ناکێڵن

# ئاوەڵکار

**یەکەم: ئاوەڵکار لە ڕووی واتاوە**

**١ـ ئاوەڵکاری کاتی**

**٢ـ ئاوەڵکاری شوێنی**

**٣ـ ئاوەڵکاری چۆنیەتی**

**٤. ئاوەڵکاری چەندێتی**

**٥- ئاوەڵکاری نەرێنی (نەفی)**

**٦. ئاوەڵکاری جەختکردن (دڵنیایی)**

**٧. ئاوەڵکاری دووبارەکردنەوە**

**٨. ئاوەڵکاری هۆ و مەبەست**

**٩. ئاوەڵکاری ڕێکخستن**

**دووەم: ئاوەڵکار لە ڕووی پێکهاتنەوە**

**١- ئاوەڵکاری سادە**

**٢- ئاوەڵکاری دارِژاو**

**٣. ئاوەڵکاری لێکدراو**

**سێیەم : ئاوەڵکار لە ڕووی ئەرکەوە**

**(نیهاد، گوزارە، تەواوکەری کاری ڕابوردوو، تەواوکەری کاری ڕانەبوردوو، تەواوکەری کاری فەرماندان).**

# ئاوەڵکار

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی (ئاوەڵکار)، ئەوە زاراوەکانی (ئاوەڵفرمان، هەڤلکار، ئادڤێرب، هاوەڵکار) بەکاردێن . ئاوەڵکاریش بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە وەسفی کارێك لە ڕستەکەدا دەکات، چونکە کات و شوێن و چۆنیەتی و چەندیەتی .....هتد کارەکە لە ڕستەدا دەستنیشان دەکات. ئاوەڵکار دۆست و هاوڕێی کارە، چونکە هەمیشە لەگەڵ کاردا دێت، واتە پەیوەستە بە کارەکەوە، ئەمەش پێچەوانەی ئاوەڵناوە، چونکە ئاوەڵناو دۆست و هاوڕێی ناو و جێناوە، کە بەهۆیەوە وەسفیان دەکات.

## پۆلێنکردنەکانی ئاوەڵکار لە زمانی کوردیدا

**یەکەم: ئاوەڵکار لە ڕووی واتاوە**

ئاوەڵکار لە ڕووی واتاوە **دەکرێت بەم بەشانەی خوارەوە**[1]:

**١ـ ئاوەڵکاری کاتی:**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێ، کە کاتی ڕوودانی کارەکە دەستنیشان دەکات. ئاوەڵکارە کاتییەکانیش لە زمانی کوردیدا بریتین لە ( وا، ئێستا، بەیانی، سبەینێ، هەفتەیەکی تر، ساڵێکی تر، دوایی، دواتر، لەپاشان، مانگێکی تر ........ هتد)،وەك:

**<u>دوایی</u> دەچم بۆ ئاهەنگەکە.**

**<u>ئێستا</u> دەچم بۆ زانکۆ.**

---

١- بۆ شارەزابوون لەم بابەتە، بگەڕێوە بۆ: ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی چواردەم (ژمارە و ئاوەڵکردار)، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٨.

**٢ـ ئاوەڵکاری شوێنی:**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە شوێنی ڕوودانی کارەکە دەست نیشان دەکەن. ئاوەڵکارە شوێنییەکانیش لە زمانی کوردیدا بریتین لە ( سەر، ژێر، ڕاست، چەپ، لەسەرەوە، لەخوارەوە، لەژێرەوە، لا، ....... هتد).

**شیلان لەژێر دارەکە خەوتووە.**

**شێرزاد لەسەرەوە دانیشتووە.**

هەندێجار پێشبەند لەگەڵ ناوەکەی دوای خۆی کە ئەرکی بەرکاری ناڕاستەخۆیە، بە یەکەوە دەبنە ئاوەڵکاری شوێنی، چونکە ئاڕاستەی شوێنی دەگەیەنن، وەکو:

**فڕۆکەکە بە ئاسماندا دەسوڕێتەوە .**

پێشبەند بەرکاری ناڕاستەخۆ

(بە ئاسماندا) ئاوەڵکاری شوێنی

**ئازاد بۆ زانکۆ ڕۆیشت .**

پێشبەند بەرکاری ناڕاستەخۆ

(بۆ زانکۆ) ئاوەڵکاری شوێنی

**٣ـ ئاوەڵکاری چۆنیەتی:**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە چۆنیەتی ڕوودانی کارەکە دەستنیشان دەکەن، ئاوەڵکاری چۆنیەتیش لە زمانی کوردیدا بریتین لە (جوان، خراپ، خێرا، چاك، باش ....هتد) .

ئاوەڵکارە چۆنیەتییەکان لە بنەچەدا ناوەڵناوی چۆنیەتین، لە حاڵەتێکدا دەبنە ئاوەڵکاری چۆنیەتی، ئەگەر لە ڕستەدا وەسفی کار بکەن، هەروەك لەم نموونانەی خوارەوە دەردەکەون:

**جوان کچێکی قەشەنگە. ........................ (ناو)**

**ڕێزان جوانە.** ......................... **(ئاوەڵناوی چۆنیەتی)**

**سۆزان جوان دەڕوات.** ......................... **(ئاوەڵکاری چۆنیەتی)**

**٤ . ئاوەڵکاری چەندێتی:**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە چەندێتی ڕوودانی کاری ناو ڕستە دەستنیشان دەکەن. ئەو وشانەی بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری چەندێتی بەکاردێن بریتین لە: (زۆر، کەم، کەمێك، تۆزێك، فرە، گەلێك، گەلێ...).وەکو :

**سۆلاف زۆر خێرا هات.**

**نانەکەم کەمێك خوارد.**

زۆرجار وشەکانی (زۆر، کەمێك.......) لەگەڵ ئاوەڵکاری تر دێن، لەم حاڵەتەشدا جگە لەوەی وشەکە دەبێتە ئاوەڵکاری چەندێتی، لەهەمان کاتیشدا پێی دەوترێ ڕادەی ئاوەڵکاری،وەکو:

**بەناز زۆر جوان دەڕوات .**



ڕادەی ئاوەڵکاری ئاوەڵکاری چۆنیەتی

هەمان وشە کاتێ لەگەڵ ئاوەڵناودا دێت، دەبێتە ڕادەی ئاوەڵناوی، وەکو:

**بەناز زۆر جوانە .**



ڕادەی ئاوەڵناوی ئاوەڵناوی چۆنیەتی

**٥- ئاوەڵکاری نەرێنی (نەفی) :**

ئەو ئاوەڵکارەیە کە نەرێنی کارەکە دەستنیشان دەکات. ئەو وشانەی بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری نەرێنی بەکاردێن بریتین لە ( هەرگیز، هەرگیزاوهەرگیز، بەهیچ شێوەیەك، بەهیچ ڕەنگێك، بەهیچ کلۆجێك ...) .

**هەرگیز ناچمە ئاهەنگەکە.**

**هەرگیزاوهەرگیز وانەکە ناخوێنم.**

**بەهیچ شێوەیەك کارناکەین.**

**٦. ئاوەڵکاری جەختکردن (دڵنیایی):**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت،کە جەخت لەسەر ئەنجامدان و جێبەجێ کردنی کارەکە دەکات. ئەو ئاوەڵکارانەی، کە بۆ مەبەست جەختکردن بەکاردێن، بریتین لە (هەر، هەڵبەت، بێگومان، بێشك، بێ سێ و دوو....) .

**هەردەچم بۆ ئەو ماڵە.**

**هەڵبەت کارەکە ناکەین.**

**بێگومان لە شەڕەکە سەردەکەوین.**

**٧. ئاوەڵکاری دووبارەکردنەوە:**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە دووبارەکردنەوە و دووپاتکردنەوەی کارێك ڕادەگەیەنن. ئەو وشانەی کە بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری دووپاتکردنەوە بەکاردێن، بریتین لە (دووبارە، دیسان، سەرلەنوێ، جارێکی دی، جارێکی تر .... ) .

**دیسان وانەکە دستی پێکرد.**

**دووبارە دەچینەوە گەشتەکە.**

**سەرلەنوێ بەهار هاتەوە.**

**٨. ئاوەڵکاری هۆ و مەبەست:**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە هۆی ڕوودانی کارێك لەگەڵ مەبەست لە جێبەجێ کردنی کارێك دەخەنە ڕوو.ئەو وشانەی کە بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری هۆ و مەبەست بەکاردێن، بریتین لە (لەبەرئەوە، لەبەرئەوەی، چونکە، لەبرسا، لەترسا، بەخۆڕایی، بەئەنقەست.....).

**پیرەمێردەکە لەداخا مرد.**

**منداڵەکە لەبرسا مرد.**

**٩. ئاوەڵکاری ڕێکخستن:**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە شێوە و جۆری جێبەجێ کردنی کارەکە دەخاتەڕوو. ئەو وشانەی کە بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری ڕێکخستن بەکاردێن، بریتین لە (ژنانە، پیاوانە، مەردانە، منداڵانە، گورگ ئاسا، تاقم تاقم، کەم کەم، دەستە دەستە،.....) .

**ئێمە لە ماڵەوە بەگشتی کاردەکەین.**

**نیوەڕۆ بە دووقۆڵی نان دەخۆین.**

**قوتابییەکان پۆل پۆل هاتنە ژوورەوە.**

**دووەم: ئاوەڵکار لە ڕووی پێکهاتنەوە**

ئاوەڵکار لە ڕووی پێکهاتنەوە بەسەر (سادە و دارژاو و لێکدراو) دابەش دەبێ:

**١. ئاوەڵکاری سادە:** بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە لە یەك وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکدێت، وەك (خێرا، هێندێ، هێمن، باش، خراپ، زۆر، فرە، ئێستا، پار، سەر، ژێر.....).

**٢. ئاوەڵکاری داڕژاو:** بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت،کە لە ئاوەڵکارێکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یاخود پاشگرێك یاخود هەردووکیان پێکدێت، وەك (بێگومان، بێ شك، بێ ناز، بێ وچان، بەتەنیا، بەکوڵ، بەپەلە .....). یاساکانی سازکردنی ئاوەڵکاری داڕژاو بەم شێوەیەی خوارەوەن:-

**١- پێشگر + ناو = ئاوەڵکاری داڕژاو**

بە + ناز = بەناز

بە + شەو = بەشەو

بێ + گومان = بێگومان

**٢- ناو + پاشگر = ئاوەڵکاری داڕژاو**

ڕۆژ + ێ = ڕۆژێ

پیاو + انە = پیاوانە

**٣- پێشگر + ناو + پاشگر = ئاوەڵکاری داڕژاو**

بە + پیاو + ەتی = بەپیاوەتی

بێ + باك + انە = بێ باکانە

بە + برا + تی = بەبرایەتی

**٤- پێشگر + ئاوەڵناو = ئاوەڵکاری داڕژاو**

بە + پەلە = بەپەلە

بە + خێرا = بەخێرا

**٥- ئاوەڵناو + پاشگر = ئاوەڵکاری داڕژاو**

دلێر + انە = دلێرانە

مەرد + انە = مەردانە

**٦- پێشگر + ئاوەڵناو + پاشگر = ئاوەڵکاری داڕژاو**

بە + جوان + ی = بەجوانی

بە + سارد + ی = بەساردی

**٧ـ پێشگر + ئاوەڵکاری سادە = ئاوەڵکاری داڕژاو**

لە + ژێر = لەژێر

لە + ناو = لەناو

٣. **ئاوەڵکاری لێکدراو:** بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە لە دوو وشە یاخود زیاتر پێکدێن. یاساکانی سازکردنی ئاوەڵکاری لێکدراو بەم شێوەیەی خوارەوەن:ـ

**١. دووبارەکردنەوەی ناو، ژمارە، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار. وەکو:**

پۆل پۆل، دەستە دەستە، تاقم تاقم ................. (ناو)

دوو دوو، سێ سێ، چوار چوار ................. (ژمارە)

جوان جوان، ورد ورد......................... (ئاوەڵناو)

کەم کەم، خێرا خێرا ........................... (ئاوەڵکار)

**٢. دووبارەکردنەوەی وشەیەك لەگەڵ کەرەسەکانی (او، ەو، بە، لە).وەکو:**

پشتاوپشت، دۆڵاودۆڵ، بانەوبان، پاشەوپاش، شاخەوشاخ، ڕۆژبەڕۆژ، ساڵ بە ساڵ، یەك بە یەك، .....

**٣. ئاوەڵناو + بە + ناو = ئاوەڵکاری لێکدراو**

پڕبەدەم، پڕبەدڵ............

**٤. ژمارە + ناو یاخود ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

یەکجار، یەکسەر، یەکشەممە، نیوەڕۆ ......

**٥. وشەی (هەر) + ناو، ژمارە، ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

هەردەم، هەردوو، هەرلا .............

**٦. وشەی (ئەم، ئەو) + ناو = ئاوەڵکاری لێکدراو**

ئەمشەو، ئەمساڵ، ئەمڕۆ ....

**٧ـ پێشگری (لە) + سەر + ئاوەڵکاری سادە = ئاوەڵکاری لێکدراو**

لەسەرلا، لەسەر پشت...

**٨ـ ناو + هو + ئاوەڵکاری سادە = ئاوەڵکاری لێکدراو**

سەر + دو + خوار = سەرەوخوار..........

**٩ـ وشە + و + وشە = ئاوەڵکاری لێکدراو**

تێروپڕ، جاروبار، گورجوگۆڵ..........

**١٠ـ پێشگر + ئاوەڵناوی لێکدراو + پاشگر = ئاوەڵکاری لێکدراو**

بە + دڵشکاو + ی = بەدڵشکاوی

**١١ـ ئاوەڵکار + ناوبەند + ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

سەر + ان + سەر = سەرانسەر

**١٢ـ ئاوەڵکار + نا + ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

پار + نا + پێرار = پارنا پێرار

دوێنێ + نا + پێرێ = دوێنێ ناپێرێ

**سێیەم : ئاوەڵکار لە ڕووی ئەرکەوە**

لە ڕستەدا ئاوەڵکار دەتوانێ ئەرك ببینێ، بەڵام ئەرکەکانی دیاریکراوە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١. ئاوەڵکار دەبێتە تەواوکەری کار، جا کارەکە ڕابوردوو بێ یا ڕانەبوردوو یا فەرماندان[1]...

- ڕێباز خێرا ڕۆیشت.

خێرا ← ئاوەڵکاری چۆنیەتی تەواوکەری کاری ڕابوردوو

ڕۆیشت ← کاری ڕابوردوو

- ڕێباز خێرا دەڕوات.

خێرا ← ئاوەڵکاری چۆنیەتی تەواوکەری کاری ڕانەبوردوو

دەڕوات ← کاری ڕانەبوردوو

- ڕێباز خێرا بڕۆ.

خێرا ← ئاوەڵکاری چۆنیەتی تەواوکەری کاری فەرماندان

بڕۆ ← کاری فەرماندان

٢.ئاوەڵکار دەبێتە تەواوکەری ئاوەڵکارێکی تر یا چەند ئاوەڵکارێکی تر...و بەیەکەوە فرێزی ئاوەڵکاری سازدەکەن.وەکو:



- ڕێباز گەلێك درەنگ هاتەوە .

گەلێك ← ئاوەڵکاری چەندێتی

درەنگ ← ئاوەڵکاری کاتی

فرێزی ئاوەڵکاری

- محەمەد بەیانی زوو زۆر خێرا بڕۆ بۆ بازاڕ.

بەیانی ← ئاوەڵکاری کاتی

زوو ← ئاوەڵکاری کاتی

فرێزی ئاوەڵکاری

زۆر ← ئاوەڵکاری چەندێتی

خێرا ← ئاوەڵکاری چۆنیەتی

فرێزی ئاوەڵکاری

٣. ئاوەڵکار دەبێتە نیهاد، ئەگەر هاتوو کاری (ڕابوردوو، ڕانەبوردوو، فەرمانداندن) لە نێو ڕستەدا نەبوو، واتە کاری ناتەواو لە ڕستەدا هەبێت. کارە ناتەواوەکانیش لە زمانی کوردیدا لە بناغەدا لە چاوگی(بوون) وەرگیراون، کە بەهۆیەوە بۆ کاتی ڕابوردوو (بوو) بەکاردێت، و بۆ کاتی ئێستا (ە) بەکاردێت و بۆ داهاتوو، ڕەگی (ب) بەکاردێت.






٤. ئاوەڵکار دەبێتە گوزارە، دیسانەکە گەر هاتوو کاری ناتەواو لە ڕستەدا هەبوو.....

- ئازاد گەلێك درەنگە. ـــ (ە) کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا

ئاوەڵکاری کاتی

تەواوکەری کاری ناتەواو، گوزاردیە




تەواوکەری کاری ناتەواوە، گوزارەیە

# پێشبەند ( پریپۆزیشن )

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە بەتەنیا بەکارنایەت، بەڵکو پێویستی بە کەرەسەی تر هەیە بۆ ئەوەی واتا ببەخشێت، ئەگەرچی پێشبەند لە بنچینەدا واتای شوێنی و ئاراستەکردن دەگەیەنێت، بەڵام هەر واتا ناگەیەنێت. پێشبەند لە ڕستەدا لە پێش ناوێك یان جێناوێك دێت، بۆ پیشاندانی پەیوەندی نێوان ئەو ناوە یان ئەو جێناوە لەگەڵ ناوێکی تری نێو ڕستەکە .

پێشبەندەکان لە زمانی کوردیدا ژمارەیان چوارە ( بە، لە، بۆ، ە)، ئەم پێشبەندانە بە زۆری لەگەڵ (ناو، جێناو، ئاوەڵناو، ژمارە ) دێن، هەر کاتێکیش پێشبەند لە ڕستەدا هەبێت، ئەوە کەرەسەکانی ناو و جێناو دەکەونە دوای پێشبەندەکانەوە و ئەرکی( بەرکاری ناڕاستەوخۆ) دەبینن، بەڵام کاتێك (ژمارە و ئاوەڵناو ) لە دوای پێشبەندەوە دێن، ئەوا ناتوانن ئەرکی (بەرکاری ناڕاستەوخۆ) ببینن، بەڵکو وشەکەی دوای ژمارە و ئاوەڵناو ئەرکی (بەرکاری ناڕاستەوخۆ) دەبینێت، وەکو:

**ئازاد دەچێت بۆ زانکۆ.**

بۆ : پێشبەند

زانکۆ : ناو، بەرکاری ناڕاستەوخۆ

**فڕۆکەکان بە ئاسماندا دەسوڕێنەوە.**

بە : پێشبەند

ئاسمان : ناو، بەرکاری ناڕاستەوخۆ

**شێرزاد لە تۆ دەچێت.**

لە: پێشبەند

تۆ : جێناو، بەرکاری ناڕاستەوخۆ

**ئاواز لە یەکەم ژوور دانیشتووە.**

لە: پێشبەند

یەکەم : ژمارەی بنجی

ژوور : ناو، بەرکاری ناڕاستەوخۆ

**ئاواز لە جوانترین ژوور دانیشتووە.**

لە : پێشبەند

جوانترین: ئاوەڵناوی چۆنیەتی

ژوور : ناو، بەرکاری ناڕاستەوخۆ

ئەم پێشبەندانە لە ڕووی ڕوخسارەوە سەربەخۆن، بەڵام لە ئاستی ڕستەسازیدا زۆرجار لە شێوەی بەنددا دەردەکەون، هەروەکو ئەمانەی خوارەوە :

**بە تۆ دەڵێم. ← پێت دەڵێم .(پێ)**

**لە تۆ دەپرسم. ← لێت دەپرسم . (لێ)**

زۆرجار پێشبەندی (ە) لەبری پێشبەندەکانی تر بەکاردێت، بەبێ ئەوەی واتای سەرەکی ڕستەکە بگۆڕێ، هەروەکو ئەم نموونانەی خوارەوە :

**ئازاد دەچێت بۆ زانکۆ .**

**ئازاد دەچێتە زانکۆ.**

**شیلان چوو بۆ کەرکوک .**

**شیلان چووە کەرکوک .**

پێشبەندەکانی (بە، لە، بۆ، ە) لە ڕووی پێکهاتنەوە سادەن، بەڵام کاتێ دەبن داڕژاو، ئەگەر لەگەڵ پاشبەنەکانەوە بێن (لە....دا، لە .....را، لە.....ەوە، بە.....دا،.....)، وەکو:

**کاروان لە هەولێرەوە هاتووە.**

**فرۆکەکە بە ئاسماندا دەسوڕێتەوە .**

مۆرفیمی (ە) لە زمانی کوردیدا نزیکەی سێزدە ئەرك و شێوەی هەیە، بۆیە دەبێت زۆر وردبین بین لە دۆزینەوەی ئەم مۆرفیمە کاتێك لە شێوەی پێشبەند دەردەکەون، بە جۆرێك لەگەڵ کاری ڕابوردوو و ڕانەبوردوو بێت، وەکو بەشە ئاخاوتنی پێشبەند سەیر دەکرێت.

## شێوە و ئەرکەکانی (ە) لە زمانی کوردیدا

مۆرفیمی (ە) یەکێکە لە مۆرفیمە چالاکەکانی زمانی کوردی، کە ئەم شێوە و ئەرکانەی خوارەوە دەبینێ:

١- دەبێتە کاری ناتەواو بۆ کاتی ئێستا، لەو حاڵەتەی کە کاری تەواو لە ڕستەدا نەبێت، وەکو :

**- شیلان زیرەکە.**

**- بەناز جوانە.**

٢- دەبێتە ناوبەند و بەشداری دەکات لە دروستکردنی وشەی لێکدراودا، واتە(( ئەم مۆرفیمە ئەتوانێ دوو وشە لە یەك نزیك بکاتەوە و بە یەکیان ببەستێتەوە))[1]. بەم شێوەیە:

ا-دروستکردنی وشەی لێکدراو لە دوو ناو[2]،وەکو:

گوڵ + ە +هێرۆ = گوڵەهێرۆ

گوڵ + ە + گونم = گوڵەگەنم[3]

ب- دروستکردنی وشەی لێکدراو لە ناو و ئاوەڵناو، وەکو[4]:

مێرگ + ە + سوور = مێرگەسوور

کێلە + ە + سپی = کێلەسپی

ج- دروستکردنی وشەی لێکدراو لە ئاوەڵناو و ناو، وەکو:

ڕەش + ە + با = ڕەشەبا

---

١- عەبدوڵلا حوسێن ڕەسوڵ (٢٠٠٥)، ئەرکەکانی مۆرفیمی(ە) لە زمانی کوردیدا، گ. سابات، ژ(١)، ل٣٨.

٢- ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٧٩)، ڕێزمانی کوردی، ناو، ل١٣٤.

٣- عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول (٢٠٠٥)، هەمان سەرچاوە، ل٣٨.

٤- ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٧٩)، هەمان سەرچاوە، ل١٣٤.

سەوز + ە + گیا = سەوزەگیا

د-دروستکردنی وشەی لێکدراو لە دووبارەکردنەوەی ناوەڵناودا[1]، نموونە:

خاو + ە + خاو = خاوەخاو

ورد + ە + ورد = وردەورد

٣- لە کاری فەرمانداندا دەبێتە جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاك، لەم حاڵەتەشدا جێناودکە ئەرکی بکەر لە ڕستەکەدا دەبینێ، وەکو:

- **بخوێنە تا دەربچی.**

- **دەرگاکە داخە.**

٤- دەبێتە پێشبەند ( پریپۆزیشن )، ئەگەر هاتوو بە کاری ڕابوردوو یان ڕانەبوردوو بلکێ و جێگەی پێشبەنەکانی (بە، بۆ) بگرێتەوە[2]، وەکو:

- **چوونە سەیران. ــــ چووین بۆ سەیران.**

**بیکەنە سەیران. ــــ بیکەن بە سەیران.**

٥-دەبێتە پاشگر بۆ دروستکردن و سازکردنی وشەی نوێ. وەکو:

چاك + ە = چاکە

سەوز = ە = سەوزە

٦- دەبێتە ئامراز و نیشانەی بانگهێشتن، وەکو[3]:

کاك + ە = کاکە

خاڵ + ە = خاڵە

---

١- عەفان حەمە شەریف (٢٠٠٠)، ئەرکی بزوێنی (ە) لە ئاستی سینتاکسدا، ل١٢٧.

٢ - ئیدریس عەبدوڵڵا (١٩٩٩)، بزوێنی (ە) لە ئاستەکانی دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی، ل١٣٢.

١ - عەفان حەمە شەریف (٢٠٠٠)، هەمان سەرچاوە، ل١٢٨.

٧- دەبێتە پاشگر لەگەڵ هەندێك قەدی چاوگ بۆ دروستکردنی ئاوەڵناوی کراوی داڕێژراو. وەکو:

کرد + ە = کردە

کوشت + ە = کوشتە

٨- دەبێتە ئامراز و نیشانەی ناسراوی، کە لەم حاڵەتەدا کورتکراوەی نیشانەی (ەکە)ی ناسراوییە، وەکو :

**کوڕە هاتە ژوورەوە.**

**کچە چووەماڵەوە.**

١٠ـ لە کرمانجی سەرووودا دەبێتە جێناوی کەسی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك لەگەڵ کاری ڕانەبوردوودا، وەکو:

**ئەو دەرسێ دنڤیسە.**

**ئەو دکەڤە.**

١١ـ دەبێتە ئامرازی دانەپاڵ و لە بری ئامرازی دانەپاڵی (ی) بەکاردێت، وەکو:

**پێنووسە ڕەشەکە بکڕە.**

جگە لەم ئەرکانە، مۆرفیمی (ە) چەندین ئەرکی تریش دەبینێ[1].

ئامرازی (ی) بەهیچ شێوەیەك وەکو پێشبەند بەکارنایەت، بەڵکو دەتوانێ ببێتە جێناو یان ئامرازی دانەپاڵ لە کاتی ئامرازی دانەپاڵدا ناوێك دەخاتە پاڵ ناوێك یاخود جێناوێك

---

١ - بۆ زیاتر شارەزابوون لە ئەرکەکانی(ە)، بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

ا- شێرکۆ بابان، چەند نهێنییەك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ە)دا، گ.کاروان، ژ(١٥٢)، ل٧٦-٧٨.

ب- نوری عەلی ئەمین، دەوری بزوێنی(ە) لە زمانی کوردیدا، گ(ڕۆشنبیری نوێ)، ژ(١١١)، ل١٦٩-١٨٢.

ج- ئەحمەد هیرانی (١٩٩٧)، سێ کێشەی ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا و چارەیان ئەبێ چی بێ؟!، گ (کاروان)، ژ (١١٢-١١٣)، ل٢٤-٢٥.

دەخاتە پاڵ ناوەڵناوێك، یان ناوەڵناوێك دەخاتە پاڵ ناوەڵناوێکی تر یان.......هتد.

هەروەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

**کوڕی ئازاد زیرەکە.**

**کچی ئەو جوانە.**

**ئێوەی تێکۆشەر سەردەکەون.**

**کوڕێکی زیرەك هات.**

## پاشبەندەکان (ەوە، وە، دا، ڕا)

بەو کەردستانە دەوترێت کە دەچنە سەر بەشی دواوەی ناوێك یان جێناوێك یان هەر بەشێك لە بەشەکانی ئاخاوتن،کاتێك پێشبەندەکان لەگەڵ پاشبەندەکان دێن، ئەوە بەیەکەوە پێشبەندێکی ناسادە دروست دەکەن، چونکە لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد کە پێشبەندی سادە لە حاڵەتێك دەبێتە ناسادە کاتێك لەگەڵ پاشبەندەکان بێت.

| سادە | ناسادە |
|---|---|
| بە | بە .... دا |
| لە | لە .... دا |
| بۆ | بۆ .... دا |

**- نامەکە بە تۆدا دەنێرم.**

نامە: بەرکاری ڕاستەوخۆ

بە : پێشبەندی سادە

تۆ : بەرکاری ناڕاستەوخۆ

دا: پاشبەند

دەنێرم: کاری ڕابوردووی تێپەڕ

**- ڕزگار دەچێت بۆ بازاڕ .**

ڕزگار: بکەرە

دەچێت: کاری ڕانەبوردووی تێنەپەڕ

بۆ: پێشبەند

بازاڕ : بەرکاری ناڕاستەوخۆ

**- کتێبەکە دەدەم بە تۆ.**

کتێبەکە: بەرکاری ڕاستەوخ.

دەدەم : کاری ڕانەبوردووی تێپەڕ

م : بکەر

بە : پێشبەند

تۆ : بەرکاری ناڕاستەوخۆ

**- کتێبەکە دەدەمە تۆ.**

کتێبەکە: بەرکاری ڕاستەوخۆ

دەدەم : کاری ڕانەبوردووی تێپەڕ

م : بکەر

ە : پێشبەند

تۆ : بەرکاری ناڕاستەوخۆ

**- لە دهۆکەوە هاتووە.**

لە: پێشبەند

دهۆك: بەرکاری ناڕاستەوخۆ

دوە: پاشبەند، پاشگری دووبارەبوونەوە

هاتووە : کاری ڕابوردووی تەواو

**-کارزان لە هەولێرا دێت .**

لە: پێشبەند

هەولێر: بەرکاری ناڕاستەوخۆ

را: پاشبەند

لە....را : پێشبەندی نادە

# ژمارە

١- ڕێگاکانی دروستکردنی ژمارە:

- کۆکردنەوە
- لێکدان

٢- جۆرەکانی ژمارە لە ڕووی پێکهاتنەوە :

- ژمارەی سادە
- ژمارەی داڕژاو
- ژمارەی لێکدراو

٣- جۆرەکانی ژمارە لە ڕووی واتاوە:

- بنجی
- کەرتی
- ڕێکخستن

**پێناسینی ژمارە:**

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە ڕێژە و ئەندازە و ژمارەی کەرەستەکان لە ڕستەدا دیاری دەکات.

بەشەئاخاوتنی ژمارە یەکێکە لەو بابەتانەی کە گیروگرفتێکی زۆری لەسەرە، چونکە زۆربەی قوتابخانە زمانەوانییە نوێیەکان بەتایبەتی (ئەمریکی و بەریتانی) لەسەر ئەو باوەڕەن،کە ژمارە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ نییە، بەڵکو بەشێکە لە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناو، یان هەندێ لە زمانەوانە کوردەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ژمارە بەشە ئاخاوتن نەبێ، بەبێ لەبەر چاوگرتنی خاسیەتی تایبەتی زمانی کوردی، دەبێ ئەوەش بوترێ کە لە قوتابخانەی زمانەوانی ڕووسی (مۆسکۆ) لە بارەی پۆلێنکردنی بەشە ئاخاوتنەکان، ژمارە بە بەشە ئاخاوتنێك سەیر دەکات.

## پۆلێنکردنەکانی ژمارە

**یەکەم: ڕێگاکانی دروستکردنی ژمارە**

هەردوو ڕێگای کۆکردنەوەو لێکدان پەیوەندی زمان بەماتماتیکەوە دەردەخات، بەهۆیەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە،کە تا چەند ئەم دوو زانستە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە.لە زمانی کوردیدا ڕێگاکانی دروستکردنی بەشێك لە ژمارە، بەم شێوەیەی خوارەوەن:

١. **ڕێگای کۆکردنەوە:**

بەهۆی کۆکردنەوە دوو ژمارە دەدرێنە پاڵ یەکترەوە، ئەم ڕێگایە لەسەر بەشی زۆری ئەو ژمارانە ئەنجام دەدرێت،کە لە سەرووی یازدەوەن، بۆنموونە :

چوار + دە = چواردە

چل + شەش = چل و شەش

پەنجا + پێنج = پەنجاوپێنج

هەشت + دە = هەژدە

ئەگەر سەیرێکی ئەم نموونانەی سەرەوە بکەین، دەبینین جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، بە جۆرێك وشەکانی ژمارە (چواردە، شازدە، حەڤدە،.......) ژمارەی لێکدراون، بەبێ ئەوەی بەهۆی ئامرازەوە بچنە پاڵ یەکترییەوە، کەچی ژمارەکانی (چل و شەش، بیست و یەك، بیست و دوو، پەنجاوپێنج ......) کە ژمارەی لێکدراون، بەڵام بەهۆی ئامرازی بەیەکبەستنی (و) بەستراون، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تردوە هەندێ لەو ژمارانە لە کاتی چوونە پاڵ یەکتری و سازکردنی ژمارەی لێکدراو، دیاردەی فۆنۆلۆجی ڕوودەدەن، وەك :

هەشت + دە = هەژدە

نۆ + دە = نۆزدە

لە نموونەی یەکەمدا، دەنگی (ش) گۆڕاوە بۆ (ژ). اە نموونەی دووەمدا، ەدەنگی (ز)پەیدابووە .

### ٢. ڕێگای لێکدان:

ئەو ژمارانە دەگرێتەخۆ، کە بەهۆی لێکدانەوە سازدەکرێن.

دوو × سەد = دووسەد

چوار × هەزار = چوار هەزار

شەش × ملیۆن = شەش ملیۆن

## دووەم: ژمارە لە ڕووی پێکهاتنەوە

### ١. ژمارەی سادە:

بەو ژمارانە دەوترێت، کە لە یەك وشەی واتادار پێکدێن، وەك (یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج، حەوت،....) (بیست، سی، چل)....هتد.

**٢. ژمارەی دارِژاو:**

بەو ژمارانە دەوترێت کە لە ژمارەیەکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یاخود پاشگرێك یان هەردووکیان پێکدێت، وەك (پەنجا، حەفتا، هەشتا، ......)...هتد.

**٣- ژمارەی لێکدراو:**

بەو ژمارانە دەوترێت، کە لە دوو ژمارە یان زیاتر پێکدێن، وەك (چواردە، سی و سێ، بیست و حەوت، دووهەزار و شەش ...)...هتد.

**سێیەم: ژمارە لە ڕووی واتاوە:**

**١. ژمارەی بنجی:**

بەو ژمارانە دەوترێت کە ژمارەی ڕاستەقینە و بنچینەیی لە خۆدەگرێت، واتە هەموو ژمارە سەرەکیەکان لە خۆدەگرێت، وەك (یەك، دوو، سێ، بیست، چل، سەد، دووسەد، هەزار، ملیۆن...)...هتد.

**سێ قوتابی هاتوون.**

**دوو پیاو مردوون .**

ژمارەی بنجی لەنێو ڕستەدا چەند تایبەتمەندیەکی هەیە، لەوانە:

دەشێ دوو ژمارەی بنجی بەیارمەتی ئامرازی (و) بێت، و دەشێ بەبێ ئامرازی (و) بێت، وەکو:

**سێ چوار قوتابی هاتوون.**

**قوتابیانی پێنج و شەش تاقیکردنەوەیان هەیە.**

بۆ دەرخستنی بڕی شتێك، ئەوا وشەیەك لەگەڵ ژمارەی بنجی دەردەکەوێت، بەیەکەوەش دەبنە وشەیەکی لێکدراو، وشەکانیش بریتین لە (سەر، دەستە، بەرگ، پارچە، چاوە، بن، دانە، چوون،...هتد). وەکو:

**ـ دوو دەستە پێنووسم کڕی.**

**ـ سێ بەرگ پەرتووکم فرۆشت.**

**ـ یەك پارچە زەویان هەیە.**

تێبینی:

١. یەکێك لە خاسیەتەکانی ژمارەی بنجی ئەوەیە، کە دەشێ بە ژمارە (ڕەقەم ) بنووسرێت، کە ئەمەش جیای دەکاتەوە لە تەواوی بەشە ئاخاوتنەکانی تر، وەك:

**چوار پیاو هاتن.**

**٤ پیاو هاتن.**

٢. لەهەمان کاتیشدا ناو واتای چەندێتی تێدایە، وەکو لەمانەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت:

(چلە، سەدە، حەفتە، ......) (چل، سەد، حەوت، .....) دیارە لێرەدا جیاوازییەکی ڕوون و ئاشکرا لە نێوانیاندا هەیە، چونکە (چلە، سەدە، حەفتە، .....) لە ڕووی بەشە ئاخاوتنەوە بەشە ئاخاوتنی ناون، لە ڕووی پێکهاتنەوە داڕژاون، ناتوانرێت بە ژمارە بنووسرێن، بەڵام (چل، سەد، حەوت.....) لە ڕووی بەشە ئاخاوتنەوە، بەشە ئاخاوتنی ژمارەن، لە ڕووی پێکهاتنیشەوە سادەن، دەشێ بە ژمارەش بنووسرێن.

٣. ئەو وشانەی لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی ژمارە دێن، دەشێت ناسراو بن یان نەناسراو، تایبەتی، گشتی، تاك، یان کۆ،.....وەکو :

**دوو پیاو هاتن .**

**دوو پیاوەکە هاتوون .**

٤. ژمارەی (یەك) کاتێك کە لەگەڵ ناوێك دێت، دەشێ وەك نیشانەیەکی نەناسراوی دەرکەوێ.وەکو:

**یەك کوڕ هاتووە.**

**کوڕێك هاتووە.**

**یەك کچ زیرەکە.**

**کچێك زیرەکە.**

یەك : وەك بەشە ئاخاوتنی ژمارە دەرکەوتووە، سەربەخۆیە.

ێك : نیشانەی نەناسراوە، لکاوە کەوتۆتە دوای ناوەکە.

## ٢. ژمارەی ڕێکخستن:

بەو ژمارانە دەوترێت، کە ئەندازە و ڕێکخستنی کەرەستەکە دەگەیەنێت، لە زمانی کوردیدا دوو یاسای تایبەتیمان هەیە بۆ سازکردنی ژمارەی ڕێکخستن، کە ئەوانیش بریتین لە:

**بنجی + ەم = ڕێکخستن**

**یەك + ەم = یەکەم**

**چوار + ەم = چوارەم**

**بنجی + ەمین = ڕێکخستن**

**چوار + ەمین = چوارەمین**

بەڵام ئەگەر ژمارەیەك بە پیتی بزوێن کۆتایی هاتبێت، ئەوا پیتێکی نەبزوێن دێتە نێوانیان، وەك:

**سێ + ەمین = سێیەمین**

**سێ + ەمین = سێهەم**

**لەیەکەمین ژوور دانیشتووم.**

**ئازاد بەیەکەم دەرچوو.**

### ٣. ژمارەی کەرتی:

بەو ژمارانە دەوترێت، کە ڕێژە و ئەندازەی کەرتەکە دیاری دەکات، بەو واتایەی چەندێتی دەگەیەنێت . لەم جۆرەدا دەبێت خانەی ژمارەکان بزانین ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە زۆرجار بە یاریدەی وشەی (لەسەر) یا پێشبەندی (لە) ژمارەی کەرتی سازدەکرێت، بەجۆرێك پێشەندی (لە) یا لەسەرەتای دەستەواژەکەوە دێت: واتە لەپێش ژمارەیەکی گەورەوە دێت و ژمارە بچووکەکەش دەکەوێتە دوای خۆیانەوە،[١] وەکو:

**لە هەزارا چل قوتابی دەرچوون.**

یانیش هەندێ جار پێشبەندی (لە) دەکەوێتە نێوان دوو ژمارەکەوە، وەکو:

**پێنج لەسەدی پارەکەم دەوێ.**

**یەك لەپێنجی مەڕەکانم دۆشی.**

یا بەهۆی وشەی (لە) کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ژماردکەوە، ودکو:

**دوو لەسەر پێنجی قوتابیان ئامادە بوون.**

**چوار لەسەر هەشتی کتێبەکانمان هێنا.**

١ ــــــــــــ ٩ یەکان

١٠ ــــــــــــ ٩٩دەیان

١٠٠ ــــــــــــ ٩٩٩ سەدان

١٠٠٠ ــــــــــــ ٩٩٩٩٩٩ هەزاران

یەك لەسەر چواری کتێبەکانم کڕی.

لە سەدا دەی قوتابییەکان دەرچوون.

---

١ - نەوڕەحمانی حاجی مارف (د)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٢٥٣ ـ ٢٥٤.

# ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشت

**ئامرازی سەرسوڕمان:**

مەبەست لە ئامرازی سەرسوڕمان یاخود ڕستەی سەرسوڕمان ئەوەیە کە قسەکەر واتە کەسی یەکەم هەستی خۆی بەرانبەر دەوروبەر دەردەبڕێ، ئەم هەست دەربڕینەش بۆ هەردوو حاڵەتی خۆشی و ناخۆشی بەکاردێت.

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێك ئامراز و وشەمان هەیە، کە ئەویش بۆ مەبەستی سەرسوڕمانی بەکاردێن، کە بەسەر دوو گرووپ دابەش دەکرێن، بەم شێوەیە :

**١. ئامرازی سەرسوڕمان بۆ حاڵەتی خۆشی(ئافەرین، ئۆخەی، ئۆخەیش، هەریژی........).**

**ئافەرین! بە یەکەم دەرچووی.**

**٢. ئامرازی سەرسوڕمان بۆ حاڵەتی ناخۆشی (ئاخ، ئۆف، پەکو، پەکوف، ئای، ئۆف، مخابن.........) .**

**ئاخ! دیسان لە وانەکە دەرنەچووم.**

لە زمانی کوردیدا ڕستەی سەرسوڕمان بە دوو شێواز دروست دەکرێت:

لە شێوازی یەکەمدا وشەی سەرسوڕمانی لە ڕستەکەدا دەبینرێت، لەم حاڵەتەشدا نیشانەی سەرسوڕمانی (!)دەکەوێنە دوای وشەکەوە و نیشانەی (.)خاڵ لە کۆتایی ڕستەکەدا دادەنرێت،وەکو:

**ئافەرین ! بە یەکەم دەرچوویت .**

**مخابن ! ئازاد دەرنەچوو .**

لە شێوازی دووەمدا وشەی سەرسوڕمانی لە ڕستەکەدا نابینرێت، لەم حاڵەتەشدا نیشانەی سەرسوڕمانی (!) دەکەوێتە کۆتایی ڕستەکەوە، وەکو :

**خانووێکی جوانە !**

**بەیەکەم دەرچوویت !**

تێبینی

لە زمان بەگشتی و لە زمانی کوردی بە تایبەتی دوو دیاردە دەبینرێت، کە ئەوانیش (هێز) و (ئاوازە)ن، مەبەست لە هێز ئەوەیە کە پالەپەستۆ و هێزێك دەچێتە سەر بڕگەیەك لە بڕگەکانی وشە، واتە دیاردەیەکی وشەسازییە. مەبەستیش لە ئاوازە ئەوەیە کەپالەپەستۆییێك دەخرێتە سەر وشەیەك لە وشەکانی ڕستە، واتە حاڵەت و دیاردەیەکی ڕستەسازییە، ئەم دوو حاڵەتەش (هێز، ئاواز) لە زمانناسی نوێدا دەچنە ناو چوارچێوەی پراگماتیکەوە، چونکە دەبێ هەردوو لایەنی قسەکەر و گوێگر هەبێ ئینجا ئەنجام دەدرێت.

## ئامرازی بانگهێشت یان بانگکردن:

مەبەست لە ڕستەی بانگکردن بەو ڕستانە دەوترێت، کە لایەنی بانگکردنی تێدایە، واتە ئامرازێك لە ئامرازەکانی بانگکردن یان نیشانەیەك لە نیشانەکانی بانگکردن دەبینرێ.

لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا تەنیا لە حاڵەتی بانگکردندا جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکرێت. ئامراز و نیشانەکانی بانکگردن بەم شێوەیەی خوارەوەن:

**ئامرازەکانی بانگکردن:**

**(ئەی، هۆ(نێر)، هێ(مێ)، ......)**

**ئەی کوڕینە وەرنە مەکتەب.**

**هێ کچینە وەرنە ماڵەوە.**

**نیشانەکانی بانگکردن:**

**ینە : بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت.**

**ە، ۆ : بۆ تاکی نێر بەکاردێت.**

**کوڕە وەرە ماڵەوە**

**ێ: بۆ تاکی مێ بەکاردێت**

**کچێ بڕۆ نان بخۆ.**

# پارتیکل

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە هەمیشە لە پاڵ کارێك یان چاوگێك دێت، ئەمیش بۆ دیاریکردنی مەبەستێك، کە دەبێتە هۆی تەواوکردنی مانای کارەکە یاخود چاوگەکە.
فۆرمەکانی پارتیکلیش لە زمانی کوردیدا بریتین لە (دەی، دە، با، دەبا، خۆ، خۆزگە،بریا، جا، دەبوو،دەبوایە،ڕەنگە،دەشێ،دەبێ، دەبێت، هاتە، خستە، دەتوانین، دەتوانێت، دەشێت، دەوێرم،...هتد).
ئەم بەشە ئاخاوتنە لە ڕووی پێکهاتنەوە سادەن و ناسادەن، بە زۆری لە پێش کارێك یان چاوگێك لەڕستەدا دێن، بەتایبەتی لەڕێژەی دانانیدا لەگەڵ کاردکانی (ڕابوردوو، ڕانەبوردوو) دەردەکەوێ، لەم حاڵەتەشدا واتای ڕستەکە دەچێتە حاڵەتی (خۆزگەیی، ویست، گومان، ئاوات، ئارەزوو، پێویست...هتد).
**دەبوو بڕۆیشتبمایە ئاهەنگەکە.**
**دەبێت تاقیکردنەوەکە ئەنجام نەدەین.**
لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی پارتیکل؛ ئەوە زاراوەی(کاری یاریدەدەر)یش بەکاردێ، هەر لەبەر ئەوەش پێی دەوترێ کاری یاریدەدەر، چونکە هاریکاریی و یاریدەدەری کار و کەرەسەی تر دەدات لە ڕستەدا . کاری یاریدەدەر کاتێ لە ڕێژەی دانانیدا دەدەکەوێ، ئەوە دەبێتە هێما و سیمایێك بۆ جیاکردنەوەی لە ڕێژەی ڕاگەیاندن و فەرماندانداندا، لەبەرئەوەی کاتێ ڕستەیەك لە شێوازو ڕێژەی دانانی دەگۆڕین بۆ ڕێژەی فەرماندان یاخود ڕاگەیاندن،ئەوە لە دەستپێکدا دەبێ پارتیکلەکان لە ڕستەدا لابەرین، هەروەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

- **دەبوو کارەکە بکەم . (ڕانەبوردووی دانانی)**
  **کارەکە دەکەم .(ڕانەبوردووی ڕاگەیاندن)**
  **کارەکە بکە .(فەرماندان)**
- **خۆزگە نانەکەم خواردبا .(ڕابوردووی دانانی)**
  **نانەکەم خوارد .(ڕابوردووی ڕاگەیاندن)**
  **نانەکە بخۆ.(فەرماندان)**

# ئامرازی بەستنەوە

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی ئامرازی بەستنەوە، ئەوا زاراوەکانی (ئامرازی لێکدەر، ئامرازی عەتف، ئامرازی پەیوەندی، ئامرازی ڕەبت،....ز) بەکاردێن، کە هەر هەموویان هەمان مەبەست دەگەیەنن.

مەبەست لە ئامرازی پەیوەندی بەو ئامرازانە دەوترێت کە بۆ بەستنەوەی دوو وشە یان دوو فرێز یا دوو ڕستە بەیەکترەوە بەکاردێن، بەمەبەستی دیاریکردنی پەیوەندی نێوان ئەم دوو وشە یاخود ئەم دوو فرێزە یاخود ئەم دوو ڕستەیە.

ئامرازەکانی پەیوەندیش لە زمانی کوردیدا بریتین لە (و، ش، یش، بەڵام، کە، بەڵکو، بەڵکی، نە...نە، یا، یان...یان، یاخود، نەك، نەوەك، نەوەکو، تا، هەتا، تاکو، هەتاکو، هەتاوەکو،...هتد)[1].

وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، کە ئەم ئامرازانە دەشێ دوو وشە یا دوو فرێز یا دوو ڕستە بەیەکەوە ببەستن، بۆ نموونە: ئامرازی پەیوەندی (و) لە زمانی کوردیدا بەم شێوانەی خوارەوە بەکاردێت:

١ـ دوو وشەی سادە دەخاتە پاڵ یەکتری و وشەیەکی لێکدراو ساز دەکات، وەکو:

هێلکەو ڕۆن، گورج وگۆڵ، لەرزوتا، مشتومڕ،...هتد).

٢ـ دوو فرێزو دەستەواژە دەخاتە پاڵ یەکتریەوە، وەکو:

**مانگا دۆشین و قەزوان خواردن نەگۆتراوە.**

٣ـ دوو ڕستەی سادە دەخاتە پاڵ یەکتریەوە، بەهۆیەوە ڕستەیەکی لێکدراو ساز دەکات، وەکو:

---

[1] - لیژنەی زمان و زانستەکان: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٣٣٣ ـ ٣٣٤.

**- من و محەمەد ڕۆیشتین.**

**- جوتیارەکە زەوییەکەی کێڵا و تۆوەکەی پێوەکرد.**

**- ئازاد نانی خوارد و ڕۆیشت.**

بەڵام ئامرازی پەیوەندی (ش - یش) تەنیا بۆ مەبەستی جەختکردن و تەئکیدکردن بەکاردێت، وەکو:

**منیش ڕۆیشتم.**

**ئەوانیش نانیان خوارد.**

هەروەها ئامرازی (یان....یان) ئەم دوو ئامرازە لە ڕستەی لێکدراودا بەکاردێ، بەتایبەتی بۆ ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردە بەکاردێ، بەهۆیەوە گوێگر سەر پشك دەکات لەهەڵبژاردنی یەکێك لەم دوو حاڵەتە، وەکو:

یان بڕۆ یان دانیشە.

یان نان بخۆ یان بڕۆ.

هەروەها ئامرازی (نە...نە) کە ئەمیش بۆ حاڵەتی نەرێ کردن بەکاردێ و هەمیشە لەڕستەی لێکدراوی نەرێدا پەیدا دەبێ، کە نەرێنی هەردوو ڕستەکەی نێو ڕستە لێکدراوەکە دەخاتەڕوو، وەکو:

**نەدادەنیشێ نە دەڕوات.**[1]

---

[1] - عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول (د)، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، چاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆران، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٣٤.

# سەرچاوەكان

١- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی یەکەم (ناو)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٧٩.

٢- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٧,

٣- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی سێیەم (ناوەڵناو)، کۆڕی زانیاری عێراق/ دەستەی کورد، بەغدا، ١٩٩٢.

٤- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی چواردم (ژمارە و ناوەڵکردار)، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٨,

٥- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی پێنجەم (کردار)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠,

٦- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، وتاری کار بەپێی ڕۆنان و چەند سەرنجێك، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٩)، ١٩٩٧,

٧- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی، ٢٠٠٤,

٨- ئیدریس عەبدوللاّ، بزوێنی (ە) لە ئاستەکانی دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی،گۆڤاری ڕامان،١٩٩٩.

٩- ئەحمەد هیرانی، سێ کێشەی ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا و چارەیان نەبێ چی بێ؟!، گ (کاروان)، ژ (١١٢-١١٣)،١٩٩٧.

١٠-تۆفیق وەهبی،دەستووری زمانی کوردی،جیزمی یەکەم،بەغدا،١٩٢٩.

١١- ڕەفیق محێدین شوانی(د)، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨,

١٢- ڕەفیق محێدین شوانی (د)،ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٤.

١٣-سعید صدقی کابان، مختصر صرف ونحوی کوردی،جزء ١، چاپخانەی نجاح، بەغدا ١٩٢٨,

١٤- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگەکانی(یەکەم و دووەم و سێیەم)، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٩,

١٥- شێرکۆ بابان، چەند نهێنیەك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ە)دا، گ.کاروان، ژ(١٥٢).

١٦- عبدالله شالی، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی(دار الجاحظ)، ١٩٧٦، بەغدا، ل٤.

١٧- عەبدوڵلا حوسێن ڕەسوڵ(د)، ئاکردن لەکوردیدا نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩١،.

١٨- عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول (د)، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، چاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆزان، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٩- عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول، ئەرکەکانی مۆرفیمی(ە) لە زمانی کوردیدا، گ. سابات، ژ(١)، ٢٠٠٥.
٢٠- عەفان حەمە شەریف، ئەرکی بزوێنی (د) لە ئاستی سینتاکسدا،گۆڤاری کاروان، ٢٠٠٠ .
٢١- عومەر مەحموود کەریم، کاری تێپەڕ و تینەپەڕ لە زمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی پەروەردە (ئیبن روشد)ی زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٤.
٢٢- لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دووەمی ناوەندی، چاپخانەی ئارام، بەغدا، ٢٠٠٧، ل ٤٥.
٢٣- لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپخانەی ئارام، بەغدا، ٢٠٠٧.
٢٤- لیژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.
٢٥- محەمەد عومەر عەول، دابەشبوونی کرداری لێکدراو لە ڕووی داڕشتن و ئەرکەوە (لە کرمانجی خواروو)دا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠١ .
٢٦-محەمەد مەعروف فەتاح، (د)، کارو پۆلێن کردنەکانی بەپێی ڕۆنان، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، ١٩٨٩.
٢٧-مصطفى محمد زەنگنە، کار و ئەرکی لە سینتاکسدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٨٩.
٢٨- نوری عەلی ئەمین، دەوری بزوێنی(ە) لە زمانی کوردیدا، گ(رۆشنبیری نوێ)، ژ(١١١).
٢٩- د.نەسرین فەخری، پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤.
٣٠- د.نەسرین فخری و د.کوردستان موکریان، ڕێزمانی کوردی،چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٢.
٣١- نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠.
٣٢- نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی، لە (صرف و نەحو)دا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٦.
٣٣- نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی، لە (صرف و نەحو)دا، بەرگی دووەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٨.
٣٤- نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، بکەر نادیار، سەنتەری ڕوناکبیری هەتاو، هەولێر، چاپخانەی شەهاب، ٢٠٠٧.
٣٥- نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، کاری تێپەڕ لێکۆڵینەوەیەکی بەرانبەرییە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گ . کاروان، ژ. (١٩٨)، ٢٠٠٥.
٣٦- پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.
٣٧- وریا عومەر ئەمین (د)، ڕەخنەی ناڕەخنە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٠)، ١٩٩٧.